حکومەتـا هەرێما کوردستـــانێ – عیراق
وەزارەتا پەروەردێ
ڕێڤەبەریا گشتی یا پرۆگرام و چاپەمەنییا

# پەروەردەیا ئیسلامی

## بۆ پۆلا دەهێ ئامادەیی
## و قۆناغا ئێکێ یا خواندنا پیشەیی و پەیمانگەهان

**ئامادەکرن**
أبـــوبکر عەلی کـاروانی

**پێداچوونا زانستی**
د. بشـــیر خلیل حـداد

**هاتییە کرمانجیکرن ژ لایێ**
تەحسین ئیبراهیم دۆسکی
ئیسماعیل طه شاهین
خواجة طه شـــاهین

**پێداچوونا زانستی**
عبدالجبـــار محمد شریف

**پێداچوونا زمانی**
نعـــمة الله محمد نهێلی

چاپا چوارێ | ٢٧١٥ کوردی | ٢٠١٥ زایینی | ١٤٣٦ مشەختی

## ب ناڤێ خودایێ مەزن و دلۆڤان

# پێشگۆتن

مامۆستاییێن بەرێز و قوتابییێن هێژا، ئەڤ کتێبا ل بەر دەستێن هەوە پرۆگرامێ نوویە یێ بابەتێ (پەروەردەیا ئیسلامی و ئاییناسی)، ئەوێ ژ لایێ وەزارەتا پەروەردەیێ یا حکوومەتا هەرێما کوردستانێڤە هاتییە دانان بۆ رێزا دەهێ ئامادەیی و قۆناغا ئێکێ ژ خواندنا پیشەیی و پەیمانگەهان، و ئەڤ پرۆگرامە دئێتە هەژمارتن پێگاڤەکا مەزن د دەلیڤەیا گۆتنا ڤی بابەتیدا، چونکی ئەڤە چەند سالە ئەڤ بابەتێ گرنگ کەڤتبوو بن بارێ پرۆگرامەکێ کلاسیکی یێ کەڤن، و وی نەدشیا ئارمانجا گۆتنا ڤی بابەتی بگەهینت. لەورا و پشتی ئەنجامدانا چەند ڤەکۆلانێن مەیدانی، و وەرگرتنا بیر و راییێن گەلەك بسپۆران د ڤێ دەلیڤەییێدا وەزارەتا پەروەردەیێ ب فەر زانی پرۆگرامەکێ نوو بۆ ڤی بابەتی بێتە دارێتن، کو د گەل وەرارا ژینا جڤاکی بگونجت، و بۆ قوتابییێن مە یێن هێژا ببتە رێنیشاندەر بۆ زانینا راستییا ئایینێ وان یێ پیرۆز، و بۆ پەیداکرنا زانینان ل سەر ئایینێن دی ژی، دا لایێ وان یێ زانستی بەرفرەهتر لێ بێت، چونکی پترییا ڤان ئایینان ل کوردستانێ و عیراقێ هەنە.

ب خواندن و دەرسدانا بابەتێن ڤێ کتێبێ، دێ بۆ هەوە ئاشکەرا بت کو ئەو ب شێوەیەکێ هەڤچەرخ هاتینە ئامادەکرن، پێخەمەت پەیداکرنا دیتنەکا رۆن و ئاشکەرا ل نك قوتابییان، و پارازتنا وان ژ تێگەهشتنا خەلەت بۆ ئیسلامێ، ئایینێ پترییا خەلکێ جڤاکا مە.

و د چاوانییا پێشچاڤکرنا بابەتاندا نوویاتی ل بەرچاڤ هاتییە وەرگرتن، و ل دووماهییا هەر بابەتەکی کۆمەکا دان و ستاندن و پسیاران هاتینەدانان، دا قوتابی پشکدارییێ تێدا بکەن، و بابەتی پتر دەولەمەند بکەن، و دا کو هاتنا وان بۆ پۆلێ نە هەما ب تنێ وەك ئەرکەکێ قوتابخانەیێ بت ل نك وان، بەلکو دا ئارمانجا وان مفاوەرگرتن و خوەپەروەردەکرن ژی بت.

ئەم ل وێ باوەرێینە کو ئەڤ پرۆگرامە دێ بتە ئێك ژ پرۆگرامێن پێشکەڤتی نە ب تنێ ل عیراقێ بەلکو ل رۆژهەلاتا ناڤین هەمییێ، و وی رۆلەکێ گرنگ ژی دێ هەبت د بلندکرنا ناڤ و دەنگێ هەرێمێدا د وارێ هزرا چاکسازی و دانانا پرۆگرامێن پەروەردەیا ئیسلامیدا.

# ڕامانا ئێکتاپەرێسییێ (التوحید)

باوەریی ب خودێ ڕامانا وێ ئەوە تە باوەری هەبت کو خودێ خودایێ هەمی تشتانە، و ئەو پەروەردگار (خالق) و خودانێ هەر تشتەکییە د ڤێ گەردوونێدا، و ئەو ب تنێ هێژایە پەرستنا وی بێتەکرن ب ڕێکا: نڤێژ و ڕۆژی و دوعا و ترس و هیڤی وخوەچەماندن و گوهدانێ. و ئەو ب تنێیە هەمی سالۆخەتێن باش هەین، و یێ دوور ژ هەر کێماسییەکێ.

پێناسەیا ئێکتاپەرێسییێ:

ئێکتاپەرێسی ئەوە: تە باوەری هەبت کو ژ بلی خودێ چو خودایێن ڕاست و دورست نینن، و وی چو هەڤال و هەڤپشك نینن نە ل ئەسمانی و نە ل ئەردی، لەو دڤێت ئەم پەرستنا وی ب تنێ بکەین، و وی ب تنێ وەك خودا بناسین.

## گرنگییا ئێکتاپەرێسییێ:

گرنگییا ئێکتاپەرێسییێ ژ ڤان خالان بۆ مە ئاشکەرا دبت:

١- خودایێ مەزن هەمی چێکری ئافراندینە دا ئەو پەرستنا وی بکەن، و ل درێژییا دیرۆکێ وی پێغەمبەر بۆ مرۆڤان هنارتینە دا ئەو پەرستنا وی ب تنێ بکەن، و ئەگەر ئەم ل قورئانێ بزڤڕین دێ بینین ئەو د گەلەك سۆرەتاندا ڤێ چەندێ دبێژت، و بەرانبەر وێ ئێکێ قورئان بەحسێ وێ زیانێ ژی دکەت یا دگەهتە مرۆڤ وکۆمەلان دەمێ ئەو هەڤپشکەکی بۆ خودێ د پەرستنێدا دانن و (شرکێ) ب وی دکەن، ئەو کارێ دبتە ئەگەرێ تێچوونا مرۆڤی ل ڕۆژا دووماهییێ.

٢- هەر پێغەمبەرەکێ خودێ هنارتی، پەیاما خوە ب گازییێ بۆ ئێکتاپەرێسییێ دەست پێکرییە، وەکی خودایێ مەزن گۆتی: ((وَمَا أَرْسَلْنَا مِن قَبْلِكَ مِن رَّسُولٍ إِلَّا نُوحِي إِلَيْهِ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنَا فَاعْبُدُونِ)) (الأنبیاء ٢٥). و پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) سێزدە سالان ل مەکەهێ بەرێ مللەتێ خوە دا پەرستنا خودایەکێ ب تنێ، و داخواز ژێ کر ئەو هەوارێن خوە بگەهینە وی ب تنێ و خوە بۆ کەسێ دی نەچەمینن، و ل درێژییا گازییا خوە پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن)

ئێکتاپەرێسیی نیشا هەڤالێن خوە ددا، وەکی دەمێ وی شیرەت ل عەبدللاهێ کوڕێ عەبباسی کری وگۆتییێ: ((**ئەگەر تە هەوارا خوە گەهاندە ئێکی، هەوارا خوە بگەهینە خودێ، وئەگەر تە داخوازا هاریکارییێ ژ ئێکی کر تو ژ خودێ بکە**)).

٣- ئێکتاپەرێسی ژ ئەگەرێن دلخوەشی و ژێبرنا گونەهانە، و ژ بەر کو ئەم مرۆڤین، دبت ئەم هندەك جاران گونەهان بکەین، بەلێ ئەگەر مرۆڤێ گونەهکار کەسەکێ ئێکتاپەرێس بت، و چو هەڤپشك بۆ خودێ د پەرستنێدا دانەنابن، ئەڤە دێ بتە ئەگەرێ دلخوەشییێ بۆ وی، ژ بەر کو خودێ ل گونەها وی بۆرت، خودایێ مەزن د فەرمۆدەیەکا قودسیدا دبێژت: ((**کوڕێ ئادەمی! ئەگەر تو بێیە نک من و تە تژی ئەردی گونەهـ هەبن، بەلێ تو بێی و تە چو هەڤپشک بۆ من د پەرستنێدا چێنەکربن، ئەز ژی هندی وێ ب لێبۆرینڤە دێ ئێمە نک تە**)).

## مفایێن ئێکتاپەرێسییێ:

خودایێ مەزن هەمی ئایین بۆ هندێ داینە دا مرۆڤ وی بناسن، و ژیانەکا خوەش ل دنیایێ و ئاخرەتێ ببەنە سەری، و ژ لایێ دەروونیڤە دا ئەو دلخوەش و تەنا بژین، و دا پەیوەندییێن براینی د هەمی لایێن ژینێ دا د ناڤبەرا کوڕێن جڤاکێدا پەیدا ببن، و دا ئەو ب دلخوەشی پێکڤە بژین.

### وئێکتاپەرێسی کو بناخەیێ هەمی ئایینێن ئەسمانییە، هەژمارەکا مفایێن مەزن تێدا هەنە، وەکی:

### ١- ئازادکرنا مرۆڤان ژ هەستا کۆلەتییێ (العبودیة):

نابت بۆ مرۆڤێ باوەری هەبت و ئێکتاپەرێس بت کو خوە بۆ ئێکی ژ بلی خودێ بچەمینت، چونکی هەر تشتەکێ هەبت ژ بلی خودێ یێ هاتییە ئافراندن، و ئەو ب خوە نەپەروەردگارە، و ئەو -بێی خودێ- نەشێت نە باشییەکێ بگەهینتە خوە و نە خرابییەکێ ژ خوە بدەتە پاش، یان ژین و مرنا خوە دەستنیشان بکەت، و ئێکتاپەرێسی مرۆڤی ژ کۆلەتی و هەستا ب خوەکێمکرنێ قورتال دکەت، و ناهێلت ئەو خوە بۆ ئێکێ دی بشکێنت، و مەژییێ خوە بێختە داڤێن ئەفسانە و درەوان، و بۆ ئێکێ دی ژ بلی خودێ بچتە سوجوودێ.

ئێکتاپەرێسی مرۆڤی دکەتە کەسەکێ زیرەك و ئازاد، یێ خودان ئیرادە و شیان کو خوە بۆ چو زۆرداران نەچەمینت، لەو مرۆڤێ موسلمان دڤێت کەسەکێ زیرەك و خودان ئیرادە بت، خەباتێ بۆ

چەسپاندنا ئازادی و دادی وپێکڤەژیان و ب جهھاتنا فەرمانا خودێ بکەت، و باوەرییێ ب یەکسانییا مرۆڤان بەرانبەر خودێ بینت، و کو کەس ژ وان ژ کەسێ دی چێتر نینە ئەگەر ب پەرستن و ڤیانا چاکییێ نەبت.

## ٢- ئاڤاکرنا کەساتییەکا هەڤسەنگ:

مرۆڤێ باوەردار و ئێکتاپەرێس، خودانێ کەسینییەکا هەڤسەنگە، و هەژهەژۆکی و دودلی ل نک وی پەیدا نابت، چونکی بەرێ وی ل خودایێ پەروەردگار ب تنێیە، وی دپەرێست و هاریکارییێ ژ وی دخوازت، و ئەو وەسا دزانت کو ژینا وی یا سەرفراز ل ڤێ دنیایێ دبتە ئەگەرا سەرفرازییا وی ل ڕۆژا دووماهییێ.

## ٣- پەیداکرنا تەناهییا دەروونی:

مرۆڤێ موسلمان دەمێ پەرستنا خودایێ مەزن ب تنێ دکەت، گیان و دەروونێ وی تژی هیڤی و تەناهی و ڤیانا ژیانێ دبت، چونکی ئەو هەست دکەت کو ئەو یێ ل بن فەرمانا خودایەکێ لێنەگر و مەرد وحەژێکەر بۆ مرۆڤی، ڤێجا ئەو ژ مرۆڤ و ئەجنە و دەهبە و تشتێن ئاشۆپی (خەیالی) ناترست، و باوەرییێ ب قەدەرا خودێ دئینت، و یێ پشتڕاستە ژ ژین و مرن و ڕزقێ خوە، و ئەو دزانت کو خودێ حەز ژ مرۆڤێ باوەردار دکەت وبەرێ وی ددەتە خێرێ، و زۆرداریێ لێ ناکەت، ژ بەر هندێ وی دەروونەکێ رەحەت و تەنا هەیە، و ئەو هەست ب خوەشییێن ژینێ دکەت.

## ٤- پەیداکرنا ئیرادەیەکا ب هێز:

مرۆڤێ موسلمان هەست ب هێزەکا ڕووحی یا مەزن دکەت دەمێ ئەو دزانت کو مەزنترین هێزا د سەر ویدا هاریکاری و پشتەڤانییا وی دکەت، لەوا هەردەم ئەو هاریکارییێ ژ وێ هێزێ دخوازت، و باوەرییێ پێ دئینت، و ل دەمێ نەخوەشی و تەنگاڤییان بێهنا خوە فرەهـ دکەت، ل دۆر ڤێ چەندێ خودایێ مەزن دبێژت: ((وَإِن يَمْسَسْكَ اللّهُ بِضُرٍّ فَلاَ كَاشِفَ لَهُ إِلاَّ هُوَ وَإِن يَمْسَسْكَ بِخَيْرٍ فَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدُيرٌ)) (الأنعام: ١٧) ئانکو: ئەگەر خودایێ مەزن زیانەکێ بگەهینتە تە، کەس نەشێت وێ ژ تە بدەتە پاش، و ئەگەر وی باشییەك گەهاندە تە، تو بزانە خودایێ تە ل سەر هەر تشتەکی خودان شیانە.

# موحەممەد (سلاڤ لێ بن)
# دووماهی پێغەمبەرە

ئەگەر ئەم ب دورستی د ڕامانا پێغەمبەرینییێ بگەهین، دێ بۆ مە ئاشکەرا بت کو نە هەر ڕۆژ پێغەمبەرەك دئێتە سەر دنیایێ، و نە هەر دەمەکی پێغەمبەرەك دئێتە هنارتن ژی، ژ بەر کو ژینا هەر پێغەمبەرەکی دەربڕینێ ژ ژینا پەیام و ڕێبازێ دکەت، ئانکو: هەر پێغەمبەرەکێ پەیاما وی بمینت زێندی ئەو ژی دێ مینت زێندی، و ئەو پێغەمبەرێن بەرێ هەر وەکی فەنابووین ونەماین چونکی ئەو خەلکێ پشتی وان هاتین ئایینێن وان گوهاڕتن، و گەلەك تشتێن بێ بناخە و بێن دلێن وان دخوازتن لێ زێدەکرن، بەلێ پێغەمبەرێ مە موحەممەد (سلاڤ لێ بن) یێ مايييە زێندی چونکی پەیام و ڕێبازا وی ب تەمامی و ئاشکەرا ل بەر دەستێ مە مایە، و ئەڤە قورئانا پیرۆز وەکی خوە و بێ گوهۆڕین ل بەر دەسێ مەیە، و ژیانا پێغەمبەری ژی (سلاڤ لێ بن) ب هەمی بەرپەڕێن خوەڤە یا بۆ مە هاتییە قەیدکرن ب ڕەنگەکێ وەسا دێ بێژی ئەم نوکە یێ وی دبینین، و هەر وەکی ئەو یێ د ناڤ مە دا دژیت و ئەمێ گوهدارییا وی دکەین، و چو کەسێن دی ل جیهانێ ئەڤ چەندە د گەل چێ نەبوویە، کو ژینا وی هەمی و ب شێوەیەکێ بەرفرەه هاتبتە پارازتن، ژ بەر ڤێ چەندێ ئەم دشێین چاڤ ل وی بکەین، و فەرمانێن وی ب کار بینین، و ئەڤە ب تنێ نیشانەکا بنبڕە کو مرۆڤان هەوجەیی ب هنارتنا پێغەمبەرەکێ دی نینە، و ئەگەر هەوجەیی ب هاتنا پێغەمبەرەکێ دی هەبت، دێ ژ بەر ئێك ژ ڤان ئەگەران بت:

**ئێک:** کو پەیاما پێغەمبەرێ بۆری نەمابت، ڤێجا هەوجەیی ب هندێ هەبت مرۆڤ دوبارە پێ بێتە ئاگەهدارکرن.

**دو:** کو پەیاما پێغەمبەرێ بۆری یا تەمام نەبت، ڤێجا هەوجەیی ب تەمامکرنێ هەبت.

**سێ:** کو پەیاما پێغەمبەرێ بۆری یا تایبەت بت ب مللەتەکیڤە، ڤێجا هەوجەیی ب هنارتنا پێغەمبەرەکێ دی هەبت بۆ مللەتێن دی.

و ئەڤرۆ چو ژ ڤان ئەگەران نینن، چونکی پەیاما موحەممەد پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) هێشتا یا زێندییە و ل بەر دەستێ مەیە، و رێکێن زانینا ڤێ پەیامێ ئاشکەرانە، و ئەم باش دزانین کانێ ئەو چ رێکە دڤێت ئەم لێ بچین، و ئەو چ رێکن دڤێت ئەم خوە ژێ بدەینە پاش، ژ بەر ڤێ چەندێ هەوجەیی ب هنارتنا چو پێغەمبەران نینە دوبارە خەلکی ل وێ پەیامێ ئاگەهدار بکەنەڤە.

هەروەسا پەیاما موحەممەد (سلاڤ لێ بن) چو کێماسی ژی تێدا نینە، و ئەو هەمی لایێن ژینێ ڤەدگرت، لەو وێ هەوجەیی ب چو ژێبرن و زێدەکرنێ نینە، هەتا پێغەمبەرەکێ دی بێت و ڤێ چەندێ بکەت.

و گومان تێدا نینە کو پێغەمبەرینییا موحەممەدی (سلاڤ لێ بن) بۆ هەمی جیهانێیە، نە کو بۆ مللەتەکی یان جڤاکەکا تایبەت، و ئەو نەبوو دەمەکێ دەستنیشانکرییە ژی، لەو چو مللەتان ل جیهانێ هەوجەیی ب هنارتنا پێغەمبەرەکێ دی نینە.

و ب ڤێ چەندێ ئەو هەر سێ ئەگەرێن بۆرین نامینن.

ژ بەر ئەوا بۆری هەمییێ دبێژنە پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن): دوماهی پێغەمبەر، ئانکو: ئەو دوماهییا هەمی پێغەمبەران هاتییە، و پشتی وی هەوجەیی ب هاتنا چو پێغەمبەرێن دی نینە، بەلکو هەوجەیی ب هندەك مرۆڤان هەیە ل دووڤ پەیاما وی بچن، و بەرێ خەلکی بدەنە ئایینێ دورست، و ئیسلامێ نیشا مللەتێن جیهانێ بدەن.

**پسيار:**

گرنگییا باوەرییێ کو موحەممەد (سلاڤ لێ بن) دووماهی پێغەمبەرە چیە؟

بەرسڤ:

١-

٢-

٣-

**دان و ستاندن:**

چونکی موحەممەد (سلاڤ لێ بن) دووماهی پێغەمبەرە، و پشتی وی چو پێغەمبەر نائێن، دڤێت عەقلی (ب ڕێکا ئجتهادێ) ڕۆلەکێ مەزن د بەرسڤدانا وان پسیاراندا هەبت ئەوێن ژ بەر وەرارا ژینێ پەیدا دبن.

# ئارمانج ژ ژیانێ و ڕاستییا دنیایێ و ئاخرەتێ و چارەنڤیسێ مرۆڤی ب دیتنا ئیسلامێ

مرۆڤ جیهانێ هەمییێ وەك یەكەیەكا ئێككگرتی دبینت، و ئەو ب هەمی بوونەوەرێن خوەڤە ژ قەستا و بێ ئارمانج دورست نەبووینە، بەلكو خودایەكێ شیاندار و كاربنەجهـ ئەو ئافراندینە، و ئەڤ هەمی بوونەوەرە ژینا خوە ب حەزكرنا خودێ و ل دووڤ هندەك قانوون و بناخەیێن زانستی دبەنە سەری، و خودێ هەردەم زێرەڤانییێ ل چێكرییان دكەت، و ئەگەر دەمەكێ ب تنێ ژی ئەو ژ وان بێ ئاگەهـ ببت، جیهان هەمی دێ ڕاوەستت و قانوونێن گەردوونێ هەمی دێ خراب بن (تێك چن).
مرۆڤێ موسلمان باوەری هەیە كو ژیانا بوونەوەری ل دووڤ سیستەمەكێ زانستی ب ڕێڤە دچت، و كو خودێ ئەو ژ بەر ئارمانجەكا بلند ئافراندییە، و هەر تشتەك د ڤێ گەردوونێدا یێ جوان و خشكۆكە، و خودایێ مەزن هەر تشتەك ژ بەر ئەگەر و (حیكمەتەكێ) دایە، لەو ژینا ل سەر ڤی ئەردی ژی ئارمانجا خوە یا بلند و پیرۆز هەیە.

## گەردوونا ئارمانجدار (الكون الهادف)

ئەگەر ئەم باش بەرێ خوە بدەینە هەر پشكەكا هەبت ژ ڤێ گەردوونێ، دێ زانین كو ئەو ژ بەر ئارمانجەكا دەستنیشانكری هاتییە ئافراندن، و ئەو ل دووڤ قانوونەكا تایبەت ب ڕێڤەدچت، بۆ نموونە:
أ- ئۆكسجین و هایدرۆجین دو توخمێن سروشتینە ژ غازێ دئێنە هەژمارتن، و هەر ئێك ژ وان سەخلەت و تایبەتمەندییێن خوە هەنە، بەلێ ئەگەر دندكەكا ئۆكسجینێ د گەل دوییێن هایدرۆجینێ بگەهنە ئێك، تشتەكێ نوی ژێ پەیدا دبت دبێژنێ: (ئاڤ)، ئەوا دبتە ئەگەرا بەردەوامییا ژینێ.

ب- ئەگەر ڕۆژ نێزیکتر با ژ ئەردی یان دوورتر با، ژین ل سەر ئەردی نەدما، ئانکو: خودایەکێ شیاندار هەیە ژ بەر ئارمانجەکا تایبەت ڕۆژ ب ڤێ دووراتییێ ژ ئەردی دانابییە.
ج- ئەگەر داروباری دووەمین ئۆکسیدا کاربۆنی نەمێتبا ئەوێ ژ هەناسەیا چێکرییان و هندەك کارتێکرنێن دی پەیدا دبت، ئۆکسجین نەددا، و ژیان و مرۆڤ ل سەر ئەردی نەدمان، ئانکو: داروبار ژی بێ ئارمانج نینە.
د- ئەگەر هەیڤ ژی ژ وی جهی دوورتر با ییێ نوکە ئەو لێ، شلق ب ئاڤا دەریاییێ نەدکەڤت، و هنگی ئەو ئاڤ دا گەنی بت، و ئەگەر هەیڤ یا نێزیکتر با ئەو ئاڤ ڕۆژێ دو جاران دا ب سەر ئەردی دا گرت، و هنگی ژین ل سەر ئەردی نەدما.
هـ- ئەگەر ئەردی ئەو بەرگێ هەوایی نەبا ئەوێ ڕێکێ ل تیشکێن ژەهردار دگرت کو بگەهنە ئەردی، وان تیشکان ژین ل ئەردی نەدهێلا.

**پشک و ئەندامێن لەشێ هەر چێکرییەکی هاریکارییا ئێکدو دکەن دا بەردەوامییێ بدەنە ژینێ و مرۆڤی ل سەر ڕوویێ ئەردی. و ئەڤە هندێ دگەهینت کو:**

أ- هەر بوونەوەرەك ژ چەند پشکێن تایبەت و دەستنیشانکری پێك دئێت.
ب- ئەڤ پشکە ب ئەندازەیەکا ڕێك و پێك هاتینە دانان.
ج- هەر پشکەکێ تایبەتمەندییەکا وەسا هەیە د گەل کارێ وێ بگونجت.
د- هەر پشکەکێ کارەکێ تایبەت هەیە دکەڤتە سەر ملان.
هـ- ڤان ئەرك و کاران پەیوەندی د گەل ئێکدو هەیە، و ب هاریکارییا ئێکدو ڕامانێ ددەن و ئارمانجان پێك دئینن.

**ئەركێ قوتابی:**

هندەك نموونەيان ژ چێكرييان بينە، و بەحسێ تايبەتمەندی و ئەرك و ڕەنگێ پەيوەندييێن وان بكە.

**پسيار:**

- چ نموونە بەلگەيە ل سەر هەبوونا قانوونەكێ ل گەردوونێ؟
- چاوا تو بەرێ خوە ددەيە وان ييێن هزر دكەن گەردوون يا بێ ئارمانجە؟
- هاريكارييا ئەندامێن هەر چێكرييەكی بۆ گەهشتنا ئارمانجێ چ دگەهينت؟
- هەبوونا قانوون و ئارمانجەكێ بۆ هەر ئەندام و پشكەكێ د لەشێ بوونەوەريدا نيشانا چييە؟
- ئەڤ وانە چەند مفايەكان نيشا مە ددەت، ژ وان:

-١

-٢

-٣

-٤

**ئەرك:**

- ڕاپۆرتەكێ ل دۆر چالاكييێن مێشهنگڤێ بنڤيسە، و كانێ چاوا ئەو هنگڤينی چێ دكەت، و ئەو ياساييێن ل جيهانا وێ هەين.
- مە ديت كو نەخشەدانان بۆ گەهشتنا ئارمانجێ پشكەكە ژ قانوونا گەردوونێ، ئەرێ تە هەی قوتابی، ئارمانجەك د ژينا خوەدا هەيە؟ و تە نەخشەيەك بۆ گەهشتنا وان ئارمانجان دانايييە؟

# ڕاستییا مرۆڤی

بهایێ هەر کەسەکی د هندێ دایە کانێ ئەو چەند د ڕاستییا هەبوونێ و جهێ مرۆڤی تێدا دگەهت، ئیمام عەلی (خودێ ژێ ڕازی بت) د گۆتنەکا خوە دا ئاماژەیێ ب ڤێ چەندێ دکەت دەمێ دبێژت: ((خودێ دلۆڤانییێ ب وی کەسی ببەت یێ بزانت ئەو ژ کیڤە هاتییە و ل کیڤەیە و دێ کیڤە چت)).

**ڤێجا فەرە تو پسیارێ ژ خوە بکەی:**

**- ئەز کیمە؟**

**- و جهێ من د هەبوونێدا چیە؟**

**- و ئەز ژ کیڤە هاتیمە و دێ کیڤە چم؟**

**- ئەز ژ نک کێ هاتیمە و دێ چمە نک کێ؟**

بەرسڤا ڤان پسیاران بۆ مرۆڤی گەلەك گرنگە، دا ئەو خوە بناست، و ڕێبازا ژینا خوە دەستنیشان بکەت، کانێ چ بکەت و چ نەکەت؟

ب ڕاستی ئەم هەمی ژ نك خودێ هاتینە، ئەوە ئەم ئافراندین: ((**هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم**)) (الأنعام: ٢) ئانکو: ئەوە یێ هوون ئافراندین. وئەم د ڤێ ژینێدا د تاقیکرنێدایینە، و کارێ مە ئەوە ئەم باشییێ بکەین، و پشتی ئەڤ ژیانە ب دووماهی دئێت ئەم جارەکا دی دێ زڤڕینە نك خودایێ خوە: ((**وَاتَّقُواْ يَوْماً تُرْجَعُونَ فِيهِ إِلَى اللّهِ**)) (البقرة: ٢٨١) ئانکو: هوون ژ وێ ڕۆژێ بترسن یا هوون تێدا دێ زڤڕنە نك خودێ.

### بهایێ مرۆڤی ل نك خودایێ مەزن

مرۆڤی بهایەکێ مەزن ل نك خودایێ مەزن هەیە، بهایەکێ وەسا بوو، فریشتە ژێ حێبەتی مابوون، و جهێ مرۆڤی ل نك خودێ هند بلندە، وی ئەو جێگر هەژمارتییە، دەمێ دبێژت: ((**وَإِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلاَئِكَةِ إِنِّي جَاعِلٌ فِي الأَرْضِ خَلِيفَةً قَالُواْ أَتَجْعَلُ فِيهَا مَن يُفْسِدُ فِيهَا وَيَسْفِكُ الدِّمَاء وَنَحْنُ نُسَبِّحُ بِحَمْدِكَ وَنُقَدِّسُ لَكَ قَالَ إِنِّي أَعْلَمُ مَا لاَ تَعْلَمُونَ**)) (البقرة: ٣٠) ئانکو: دەمێ خودێ گۆتییە فریشتەیان: ئەز دێ جێگرەکی ل ئەردی دانم، وان گۆت: ئەرێ دێ وی لێ دانی یێ خرابییێ تێدا دکەت و خوونێ دڕێژت، و

ئەم ب سوپاسیڤە تە پاك دكەین، و تە پیرۆز دبینین؟ وی گۆت: یا ئەز دزانم هوون نوزانن.

و ژ ئایەتەكا دی بۆ مە ئاشكەرا دبت كو خودایێ پاك و پیرۆز هێزەكا مەزن بۆ شیانا ب دەستڤەئینانا زانینێ دایییە مرۆڤی، ب ڕەنگەكێ وەسا كو ئەو بشێت ڕاستییا خوە و وێ جیهانا ئەو تێدا بزانت، و خودایێ خوە و ناڤ و سالۆخەتێن وی بناست، و حەز ژ وی بكەت و هاریكارییێ ژ وان بخوازت: ((وَعَلَّمَ آدَمَ الأَسْمَاء كُلَّهَا ثُمَّ عَرَضَهُمْ عَلَى الْمَلاَئِكَةِ فَقَالَ أَنبِئُونِي بِأَسْمَاء هَؤُلاء إِن كُنتُمْ صَادِقِينَ﴿٣١﴾ قَالُواْ سُبْحَانَكَ لاَ عِلْمَ لَنَا إِلاَّ مَا عَلَّمْتَنَا إِنَّكَ أَنتَ الْعَلِيمُ الْحَكِيمُ﴿٣٢﴾ قَالَ يَا آدَمُ أَنبِئْهُم بِأَسْمَآئِهِمْ فَلَمَّا أَنبَأَهُمْ بِأَسْمَآئِهِمْ قَالَ أَلَمْ أَقُل لَّكُمْ إِنِّي أَعْلَمُ غَيْبَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَأَعْلَمُ مَا تُبْدُونَ وَمَا كُنتُمْ تَكْتُمُونَ﴿٣٣﴾)) (البقرة: ٣١-٣٣). ئانكو: قەدرگرتن بۆ ئادەمی خودێ ئەو فێری ناڤێن هەمی تشتان كر، پاشی وی ئەو ناڤلێكری بۆ فریشتەیان بەرچاڤكرن وگۆتە وان: ناڤێن ئەڤان تشتێن هە بۆ من بێژن ئەگەر هوون ڕاستگۆنە كو هوون بۆ جێگرییا ل ئەردی ژ وان هێژاترن. فریشتەیان گۆت: ئەی خودا ئەم تە پاك دكەین، ژ بلی وی تشتێ تە نیشا مە دای ئەم چو نزانین، هندی تویی تو ب تنێ ب كارێ ئافرانديیێن خوە یێ پڕزانایی، وتو د كریارا خوە دا یێ كاربنەجهی. خودێ گۆت: ئەی ئادەم تو ناڤێن ڤان تشتان یێن وان نەزانین بۆ وان بێژە، ڤێجا دەمێ وی ئەو ناڤ بۆ وان گۆتین، خودێ گۆتە فریشتەیان: مانێ من گۆتبوو هەوە هندی ئەزم ئەز تشتێ ڤەشارتی ل بەر هەوە ل ئەسمانان و ل ئەردی دزانم، و وی كارێ هوون ئاشكەرا دكەن ویێ هوون ڤەدشێرن ئەز دزانم.

د ڤان ئایەتان دا خودایێ مەزن پشكەكێ ژ شیان و سروشتێ مرۆڤی نیشا مە ددەت كو ئەوی شیانا فێربوون و زانینا ڕاستییان و ئاڤاكرنا ئەردی و شارستانییێ هەیە، و ئەو هندەك تشتن ب ڤی ڕەنگی ل نك فریشتەیان نینن، چونكی ئەو بۆ ئارمانجەكا دی هاتینە ئافراندن، و خودایێ مەزن مرۆڤ وەسا ئافراندییە ئەو بشێت ب كارێ جێگرییێ ڕابت.

و ب ڤێ چەندێ ئەم دگەهینە ڕاستییەكێ ئەو ژی ئەوە كو پشكەك ژ مەزنییا مرۆڤی پەیوەندی ب ئاستێ شیان و بەرهەڤییا ویڤە هەیە بۆ فێربوونێ و ب دەستڤە ئینانا زانینان، و ب كارئینانا خێرێن ئەرد و ئەسمانی بۆ مفایێ خوە، و پێشڤەبرنا ژینا مرۆڤینییێ.

و بەرانبەر ڤێ چەندێ هەر هزر و سیاسەت و بۆچوون وکەلتوور و گازییەکا دژی فێربوونا مرۆڤی و ب دەستڤەئینانا وی بت بۆ زانینێ دا کو ئەو د خوە و دگەردوونێ بگەهت، دێ دژی وێ حەزکرنا خودایێ مەزن بت یا وی بۆ مرۆڤی حەزکری، و خودایێ مەزن زانین کرییە پیڤەر بۆ بهایێ خودانی، دەمێ گۆتی: ((قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ)) (الزمر: ٩) ئانکو: ئەرێ ما مرۆڤێن زانا و یێن نەزان دێ وەکی ئێك بن؟ بێ گومان ئەو وەکی ئێك نابن، چونکی ئەو زانایێن زانینا خوە بۆ خزمەتا مرۆڤی و مرۆڤینییێ تەرخان دکەن، و خودایێ خوە باش دناسن، بهایەکێ مەزن وان هەیە.

و پێغەمبەر ژی (سلاڤ لێ بن) د گەلەك فەرمۆدەیان دا بەرێ مرۆڤێ موسلمان ددەتە فێربوون و ب دەستڤە ئینانا زانینێ، وەکی دبێژت: ((أطلب العلم من المهد إلى اللحد)) هەر ژ لاندکێ هەتا گۆڕی ل دووڤ زانینێ بگەڕە، ئانکو: دڤێت ژینا تە هەمی زنجیرەکا بێ ڤەبڕین بت پێخەمەت بلندکرنا ئاستێ تە یێ زانستی. و د فەرمۆدەیەکا دیدا دبێژت: ((طلب العلم فريضة على كل مسلم)) ئانکو: خوازتن و دووڤگەڕیانا زانینێ فەرە ل سەر هەر موسلمانەکی، چ مێر بت چ ژن. و ژ ڤێ فەرمۆدەیێ ئاشکەرا دبت کو گرتنا ڕێکێ د ناڤبەرا ژنێ و زانینێدا گونەهە، و ئەو پێلێنانا فەرمانا پێغەمبەرێ ئیسلامێیە (سلاڤ لێ بن)، و خودێ دەمێ مرۆڤ ل ئەردی کرییە جێگر، وی نفشێ مرۆڤی، نە کو مێر ب تنێ، کرە جێگر، و مێر و ژن د مرۆڤینییێدا یەکسانن، و فەرمان ژ هەردویان دگرت، و ئەڤە هندێ دگەهینت کو دڤێت ژن ژی وەکی مێری خوە ب زانینێ چەکدار بکەت، دا بشێت ب دورستی ب کارێ جێگرییێ ڕاببت، و هەر جوداییەکا د ناڤبەرا ژن و مێراندا د ڤێ چەندێدا بێتە دانان، دێ دژی بۆچوونا ئیسلامێ بت د مەسەلا جێگرییا مرۆڤی.

و ب ڕەنگەکێ گشتی دەمێ مرۆڤ هەست ب هندێ دکەت کو خودێ ئەو ل ئەردی یێ کرییە جێگر، دێ هەست ب بها وگرنگییا خوە و ڕۆلێ خوە یێ مەزن د ژیانێ و جیهانێدا کەت، و دێ کاری بۆ پارازتنا وی بهایی کەت ئەوێ خودێ دایییێ، و هزر ناکەت ب ڕەنگەکێ وەسا بژیت کو د گەل وی بهایێ مەزن نەگونجت.

**دان و ستاندن:**

جێگرییا خودێ د ئەردیدا چ ڕامانێ دگەهینت؟ و ئەو چ تایبەتمەندی بوو، مرۆڤ هێژایی هندێ کری، ببتە جێگرێ خودێ د ئەردیدا؟

# بهاداری خەلاتەکە
# ژ خودێ بۆ مرۆڤی

ب دیتنا ئیسلامێ مرۆڤ دئێتە هەژمارتن چێکرییەکێ بهادار ل نك خودێ، و خودێیە بها و (کەرامەت) داییە وی، لەو دڤێت مرۆڤ - و نەخاسمە باوەردار - هەست ب ڤێ بهادارییێ بکەت، خودایێ مەزن دبێژت: ((وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ وَحَمَلْنَاهُمْ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ وَرَزَقْنَاهُم مِّنَ الطَّيِّبَاتِ وَفَضَّلْنَاهُمْ عَلَى كَثِيرٍ مِّمَّنْ خَلَقْنَا تَفْضِيلاً)) (الاسراء: ٧٠) ئانكو: مە قەدر و بها داییە مرۆڤی، و رێکێن ژینێ ل هشکاتی و دەریایێ بۆ وی خوەش کرینە، و مە رزقەکێ حەلال و پاقژ داییێ، و مە ئەو ب سەر گەلەك چێکرییان ئێخستییە.

ژ ڤێ ئایەتێ بۆ مە ئاشکەرا دبت کانێ بهایێ مرۆڤی چەندە، و خودێ چاوا بەرێ خوە ددەتە وی، و کو ڤی مرۆڤی روومەتەکا مەزن ل نك وی هەیە، ڤێجا فەرە ئەو ب خوە ژی ڤی بهایی بزانت، و نابت بۆ کەسەکی یان لایەکی وی بێ بها بکەت یان بشکێنت، و خودایێ مەزن ئاماژەیێ ددەتە هندەك لایێن بهادارییا مرۆڤی کو خودێ رێکێن ژیارێ ل بەر وی خوەش کرینە، و هەمی چێکرییێن دی د گەردوونێدا بندەستی وی کرینە، و ئەو ب مە ددەتە زانین کو بهایێ مرۆڤی ژ یێ هەمی چێکرییان بلندترە، و خودێ ب دانا گەلەك قەنجی و هێز و شیانان بها داییە وی، و ئەو ب سەر گەلەك چێکرییێن دی ئێخستییە.

## خودایێ مەزن ب چ رەنگی مرۆڤ ئافراندییە (چێکرییە)؟

خودایێ مەزن مرۆڤ وەسا ئافراندییە، کو ئەو بشێت تشتێن جوان و کرێت، باش و خراب، ژێك جودا بکەت، و دەمێ مرۆڤ کارێ باش دکەت و سالۆخەتێن قەنج ل نك خوە پەیدا دکەت، ئەو د دل دا هەست ب بلندی ورەحەتییێ دکەت، و بەروڤاژی وێ چەندێ ئەگەر وی خرابی کر ئەو دشێت حسێبێ د گەل خوە بکەت و خوە باش بکەت، خودایێ مەزن دبێژت: ((وَنَفْسٍ وَمَا سَوَّاهَا﴿٧﴾ فَأَلْهَمَهَا فُجُورَهَا وَتَقْوَاهَا﴿٨﴾)) (الشمس: ٧-٨) ئانکو: سووند ب نەفسێ و ئەوێ ئەو ئافراندی، و بەرێ وێ داییە باشی و خرابییێ.

ژ ڤێ ئایەتێ بۆ مە ئاشکەرا دبت کو مرۆڤ بوونەوەرەکێ تایبەتە، نە فریشتەیە و نە شەیتانە، چونکی فریشتە فەرمانا خودێ ناشکێنن، و ئەو تێکدا باشی و خێر و چاکینە، و نیشانا پاکیێنە، و بەرانبەر وان، شەیتان نیشانا خرابی و گونەهێیە، بەلێ د ناڤبەرا واندا مرۆڤی سالۆخەتێن باشی و خرابییێ هەنە. و مرۆڤ - نەخاسمە باوەردار - دڤێت هەردەم خوە چاك بکەت، و باش خوە د ئیسلامێ بگەهینت، و سالۆخەتێن مرۆڤی یێن چاك بزانت، و ژینگەهەکا ساخلەم پەیدا بکەت کو تێدا بەرێ وی بۆ خێرێ و کارێ چاك بێتەدان. سالۆخەتێن باش د دلێ خوە دا پەیدا بکەت، دا ب وێ چەندێ ببتە مرۆڤەکێ خێرخواز و حەژێکەر بۆ دادی و چاکییێ، و یێ دوور ژ خرابی و زۆر و ستەم و ڕەوشتێن خراب.

و ب ڤێ چەندێ بۆ مە ئاشکەرا دبت کو ئەم بەرپرسین بەرانبەر خوە و مەژییێ خوە، و دڤێت چاڤێ مە ل ڤێ بەرپسیارییێ بت.

## ژێدەرێ بهاداری و بلندییا مرۆڤی چییە؟

ئەو تایبەتمەندی و جهێ بلند و بهادارییا مرۆڤی ل نك خودێ هەی، د ناڤبەرا هەمی چێکرییێن دیدا ل ڤێ گەردوونێ، ژێدەرێ وێ چییە؟

ب ڕاستی ئەڤ بهاداری و جهێ بلندێ مرۆڤی هەی ژ بەر وێ ڕوحێیە یا خودێ داییە مرۆڤی و ئەو پێ دژیت.. دەمێ خودێ مرۆڤ ژ ئاخێ ئافراندی، وی ڕوح داییێ، و ب ڤێ چەندێ وی بهایێ مرۆڤی و هێز و شیانێن وی بەرچاڤ کرن، خودایێ مەزن دبێژت: ((**إِذْ قَالَ رَبُّكَ لِلْمَلَائِكَةِ إِنِّي خَالِقٌ بَشَراً مِن طِينٍ﴿٧١﴾ فَإِذَا سَوَّيْتُهُ وَنَفَخْتُ فِيهِ مِن رُّوحِي فَقَعُوا لَهُ سَاجِدِينَ﴿٧٢﴾**)) (ص: ٧١-٧٢) دەمێ خودێ گۆتییە فریشتەیان: ئەز دێ مرۆڤەکی ژ تەقنێ ئافرینم، ڤێجا ئەگەر من ئەو دورستکر و ژ ڕوحا خوە داییێ، هوون سوجدەیێ بۆ وی ببەن (خوە بۆ وی بچەمینن).

و دەمێ خودێ بیرا مە ل هندێ دئینتەڤە کو وی ئەم ژ تەقنێ چێکرینە ڤێ پتر ژ ئاماژە و دەرسەکێ تێدا هەیە، ژ لایەکیڤە ئەو شیان و مەزنییا خودێ بۆ مە بەرچاڤ دکەت، و ژ ئالییەکێ دیڤە ئەو مە فێر دکەت کو مرۆڤ هەمی وەکی ئێکن و ژ ئێك تشتی و ژێدەری هاتینە ئافراندن، و وان خودایەکێ ب تنێ هەیە.

و ئەو بەرێ مە ددەتە هندێ ژی کو ئەم خوە مەزن نەکەین، و نزم بەرێ خوە نەدەینە خەلکێ دی، چونکی هندەك مرۆڤ ژ ئاخێ دورست نەبووینە و هندەك ژ زێڕی، بەلکو ئەو هەمی ژ تشتەکی دورست بووینە و ژێدەرێ وان ئێکە.

هەر وەسا ئەڤ ئایەتە ڕادگەهینن کو مرۆڤ ب وێ ڕوحێ دژیت یا خودێ داییێ، و ئەڤە وێ ڕامانێ ددەت کو ڕوحا خودێ د مرۆڤیدا ئامادەیە، لەو کێمکرنا مرۆڤی یان زۆرداریيا ل وی گونەهەکا مەزنە و سڤکییە ب مەزنی و پیرۆزییا خودێ دئێتەکرن.

خودێ بهایێ مرۆڤی هند مەزن کرییە کو فریشتەییێن پاك و نێزیکی خودێ، بۆ ئادەمی بچنە سوجدەیێ ل وی دەمێ کو سوجدە ب تنێ بۆ خودێیە، بەلێ ئەو سوجدە ب فەرمانا خودێ بوو، و قەدرگرتن بوو بۆ ئادەمی.

### پسیار:

١- بۆچ هندەك مرۆڤ ل هندەك دەمان بهایێ خوە یێ بلند نزانن، و ب ڕەنگەکێ وەسا کاری دکەن کو د گەل بهادارییا وان و مەزنییا خودێ نەگونجت؟

٢- چاوا مرۆڤ دێ هەست ب بهایێ خوە یێ بلند کەت، و ڕەفتارەکێ وەسا ناکەت یێ هەڤژ بت بۆ وێ چەندێ؟

### دان و ستاندن و دووڤچوون:

أ- ئەو چ بهانە مرۆڤ بلندتر لێکری ژ بوونەوەرێن دی؟

ب- ژ بلی وان ئایەتێن بۆرین، تو دشێی هندەك ئایەتێن دی بینی بهادارییا مرۆڤی بەرچاڤ بکەن؟

## مرۆڤ و ژێدەرێن گونەهان

بەلێ د گەل ڤی بهایێ بلند یێ خودێ داییە مرۆڤی، کو تشتەکە وی بەر ب قەنجی و چاکی و بلندییێ ڤە دبەت، بۆچ هندەك مرۆڤ هەنە کارێ خراب و گونەهان دکەن، رێکا چاکییێ و رەوشتێن بلند وخودێناسییێ ل بەر خوە بەرزە دکەن؟

زانینا ژێدەر و ئەگەرێن سەرداچوون و کرنا گونەهان هاریکارییا مە دکەت کو ئەم خوە ژ کرنا گونەهان بدەینە پاش، ڤێجا دلێن مە تەنا ببن و ژیانا مە خوەش ببت، و رێ بۆ سەرداچوون وسەردابرنێ نەمینت. و ئەگەر ئەم بەرێ خوە بدەینە قورئانا پیرۆز دێ بینین کو خودایێ مەزن بەحسێ هەژمارەکا ئەگەر و ژێدەرێن سەرداچوون و گونەهێ بۆ مە کرییە، و ئەڤە هندەك ژ وانن:

أ- هەست نەکرن ب زێرەڤانییا خودێ و نێزیکییا وی ژ مە:

خودایێ مەزن هەردەم د گەل مەیە، و ئەو مە دبینت، یێ نێزیکە ژ مە، و ئەو ب کارێ مە یێ ئاگەهدارە، وەکی ئەو ب خوە دبێژت: ((وَلَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ وَنَعْلَمُ مَا تُوَسْوِسُ بِهِ نَفْسُهُ وَنَحْنُ أَقْرَبُ إِلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدِ)) (ق: ١٦) ئانکو: ئەمین مە مرۆڤ ئافراندی، و ئەم دزانین کانێ چ دئێتە سەر هزرا وی.

ڤێجا ئەگەر موسلمانی زانی کو خودێ شارەزایە ب وی تشتێ د هزرا ویدا هەی، و چو تشت ل بەر بەرزە نابن، و ئەو گەلەك یێ نێزیکی مەیە، هنگی ئەو دێ هەست ب زێرەڤانییا خودێ کەت، و دێ خوە ژ کرنا گونەهێ دەتە پاش.

ب- ڤیانا زێدە بۆ دنیایێ و بێ ئاگەهی ژ رۆژا دووماهییێ:

خودایێ مەزن دبێژت: ((كَلَّا بَلْ تُحِبُّونَ الْعَاجِلَةَ ﴿٢٠﴾ وَتَذَرُونَ الْآخِرَةَ ﴿٢١﴾)) (القيامة: ٢٠-٢١) ئانکو: نەخێر! وە نینە وەکی هوون هزر دکەن، بەلکو هوون گەلەك حەز ژ دنیایێ دکەن، و هوون ئاخرەتێ دهێلن و پشت ددەنێ.

ئیسلام رێکێ ل مە ناگرت ئەم حەز ژ دنیایێ بکەین، و کاری بۆ ژیانەکا خوەش و بەرفرەهـ بکەین، بەلێ تشتێ ئیسلام خراب دزانت ئەوە مرۆڤ ب دنیایێ ب تنێڤە مژوول ببت و ئاخرەتێ ژ بیر

بکەت، و هزرا هندێ نەکەت کو جیهانەکا دی هەیە، مرۆڤ تێدا زێندی دبتەڤە، و سەرا کارێ وی یێ دنیایێ حسێب د گەل دئێتەکرن.

ج- نەهشیاری ل شەیتانی و دووکەڤتنا پێگاڤێن وی:

وەکی ئەم دزانین خودایێ مەزن ئەم ئاگەهدار کرینە کو شەیتان دژمنە بۆ مرۆڤی، و دڤێت ئەم وی وەك نەیار بۆ خوە بزانین: ((إِنَّ الشَّيْطَانَ لَكُمْ عَدُوٌّ فَاتَّخِذُوهُ عَدُوّاً)) (فاطر: ٦) شەیتان دژمنێ هەوەیە، ڤێجا هوون ژی وی بۆ خوە بکەنە دژمن. هەر وەسا خودایێ مەزن د گەلەك ئایەتاندا مە ژ پیلانێن شەیتانی و فێلێن وی بۆ سەردابرنا مرۆڤی ئاگەهدار دکەت، وەکی د ڤێ ئایەتێ دا هاتی: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ كُلُواْ مِمَّا فِي الأَرْضِ حَلاَلاً طَيِّباً وَلاَ تَتَّبِعُواْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ إِنَّهُ لَكُمْ عَدُوٌّ مُّبِينٌ ﴿١٦٨﴾ إِنَّمَا يَأْمُرُكُمْ بِالسُّوءِ وَالْفَحْشَاء وَأَن تَقُولُواْ عَلَى اللّهِ مَا لاَ تَعْلَمُونَ ﴿١٦٩﴾)) (البقرة ١٦٨-١٦٩)

خودایێ مەزن ئاگەهداریيا مرۆڤان دکەت کو هەر تشتەکێ باقژێ ل ئەردی هەی وی بۆ وان حەلال کرییە، و دڤێت ئەو دووکەڤتنا پێگاڤێن شەیتانی نەکەن؛ چونکی ئەو دژمنەکێ ئاشکەرایە بۆ وان، و ئەو فەرمانا ب کرنا گونەهێ و خرابییێ ل وان دکەت، و کو ئەو وی تشتێ ئەو نەزانن د دەرهەقا خودێدا بێژن.

ژ ڤێ بۆ مە ئاشکەرا دبت کو کرنا خرابییێ و گونەهان و چوونا ل رێکا خەلەت، ب جهئینانا فەرمانا شەیتانییە، ل وی دەمێ کو دڤێت موسلمان فەرمانێن خودایێ خوە ب جه بینت، و گوهدارییا وی نەکەت یێ خودێ ژ دلۆڤانییا خوە بێ بار کری، ڤێجا وی کارێ خوە کرییە گونەه و خرابی.

### پسیار:

رێ چییە بۆ نەکرنا گونەهـ و کارێن خراب؟

### دان و ستاندن:

چ پالدەرێن دی هەنە مرۆڤی بەر ب سەرداچوون و کرنا خرابییێڤە ببەن؟

### ڤەکۆلان:

بۆچ مرۆڤ گوهدارییا شەیتانی دکەت؟ و دزانت ژی کو ئەو دژمنێ وییە؟

# خەفک و داڤێن شەیتانی

شەیتان دژمنێ مرۆڤییە، و ئەو خوە ژ وی مەزنتر دبینت، و وی سووند خوارییە کو هندی ژێ بێت ئەو بەنیێن خودێ ژ ڕێکا ڕاست دەربێخت، و داڤان ل بەر وان ڤەدەت، و پیلانان دژی وان بگێڕت، دا تۆلا خوە ژ وان بستینت کو خودێ سەرا بابێ وان، ئەو ژ دلۆڤانییا خوە بێ بار کر، و کارێ وی ئەوە دودلییێ بۆ مرۆڤی چێ بکەت، و هندەك سۆز و ژڤانێن درەو بدەتێ، و ئامیرەتێ وی بۆ ب جهئینانا ڤێ چەندێ حەز و دلچوونێن مرۆڤینە، ب ڤێ ڕێکێ ئەو کاری بۆ خاپاندن و سەرداچوونا مرۆڤی دکەت، و هندەك هیڤییێن دژوون (پیس) و نەڕاست ددەتە بەر دلێ وی، ڤێجا نەخوەشی و گرفتارییان بۆ وی پەیدا دکەت، و دنیایێ و ئاخرەتێ ل بەر وی نەخوەش دکەت.

شەیتان ب گەلەك ڕێکان دئێتە مرۆڤی، و وی بۆ هندێ پال ددەت کو ئەو گونەهان بکەت و فەرمانێن خودێ ب جه نەئینت، ژ وان ڕێکان:

١- جوانکرنا گونەهێ و کارێ خراب، وەکی خودایێ مەزن گۆتی: ((وَزَيَّنَ لَهُمُ الشَّيْطَانُ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ)) (الأنعام: ٤٣) ئانکو: شەیتانی ئەو کار ل بەر وان شرین کر یێ وان دکر.

٢- مژوولکرنا مرۆڤان ب حەز و ڤیانێن دنیایێڤە، وەکی خودایێ مەزن گۆتی: ((اسْتَحْوَذَ عَلَيْهِمُ الشَّيْطَانُ فَأَنسَاهُمْ ذِكْرَ اللَّهِ أُوْلَئِكَ حِزْبُ الشَّيْطَانِ أَلَا إِنَّ حِزْبَ الشَّيْطَانِ هُمُ الْخَاسِرُونَ)) (المجادلة: ١٩) ئانکو: شەیتانی ب سەر دلێن واندا گرت، و خودێ ژ بیرا وان بر، ئەو دەستەکا شەیتانینە، و دەستەکا شەیتانینە یێن زیاندار.

٣- مژوولکرنا مرۆڤی ژ بیرئینانا خودێ و وان کاران یێن بیرا وی پێ ل خودێ دئێتەڤە وەکی نڤێژێ، و چاندنا تۆڤێ کەرب و نەڤیانێ د ناڤبەرا مرۆڤاندا، وەکی خودایێ مەزن گۆتی: ((إِنَّمَا يُرِيدُ الشَّيْطَانُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ الْعَدَاوَةَ وَالْبَغْضَاء فِي الْخَمْرِ وَالْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ اللَّهِ وَعَنِ الصَّلاَةِ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾ وَأَطِيعُواْ اللَّهَ وَأَطِيعُواْ الرَّسُولَ وَاحْذَرُواْ فَإِن تَوَلَّيْتُمْ فَاعْلَمُواْ أَنَّمَا عَلَى رَسُولِنَا الْبَلاَغُ الْمُبِينُ ﴿٩٢﴾)) (المائدة: ٩١-٩٢) ئانکو: هەما شەیتانی دڤێت ب ڕێکا ڤەخوارنا مەیێ و کرنا قومارێ کەرب و نەڤیانێ د ناڤبەرا هەوەدا بچینت، و هەوە ژ بیرئینانا خودێ و کرنا نڤێژێ بدەتە پاش،

ئەرێ ڤێجا هوون دێ مەیێ و قومارێ هێلن؟ گوهدارییا خودێ و پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بکەن، و بزانن کو ئەگەر هەوە پشت دا دینێ خودێ هەما یا ل سەر پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ب تنێ گەهاندنا پەیاما خودێیە.

ژ بەر ڤێ چەندێ فەرە ل سەر مرۆڤی ڤان ڕێکان بزانت، و گوهدارییا شەیتانی نەکەت، و خوە نەئێختە داڤێن وی، چونکی ئەگەر هات و ئەو کەڤتە داڤێن شەیتانی ئەو ژ پەشێمانییێ پێڤەتر تشتەکی ب دەست خوە ڤە نائینت، و ل ڤێرێ دڤێت ئەم بزانین کو شەیتان نەشێتە موسلمانێ ڕاست و دورست، و دەمێ مرۆڤەك گوهدارییا وی دکەت و د سەردا دچت، ڕۆژا دووماهییێ شەیتان خوە ژ وی بەری دکەت، و دبێژت: سووچێن من نینن و ئەوە یێ گونەهکار، ئەو کەسەکێ لاواز بوو لەو فەرمانێن من ب جه دئینان! خودێ ڤێ چەندێ بۆ مە ئاشکەرا دکەت، دەمێ دبێژت: ((وَقَالَ الشَّيْطَانُ لَمَّا قُضِيَ الأَمْرُ إِنَّ اللّهَ وَعَدَكُمْ وَعْدَ الْحَقِّ وَوَعَدتُّكُمْ فَأَخْلَفْتُكُمْ وَمَا كَانَ لِيَ عَلَيْكُم مِّن سُلْطَانٍ إِلاَّ أَن دَعَوْتُكُمْ فَاسْتَجَبْتُمْ لِي فَلاَ تَلُومُونِي وَلُومُواْ أَنفُسَكُم مَّا أَنَاْ بِمُصْرِخِكُمْ وَمَا أَنتُمْ بِمُصْرِخِيَّ إِنِّي كَفَرْتُ بِمَا أَشْرَكْتُمُونِ مِن قَبْلُ إِنَّ الظَّالِمِينَ لَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ)) (إبراهيم: ٢٢) ئانکو: پشتی مەسەلە ب دووماهی دئێت شەیتان دبێژت: خودێ ژڤانەکێ ڕاست دابوو هەوە، و من ژڤانەك دابوو هەوە، ومن ژڤانێ خوە ب جه نەئینا، و من چو دەستهلات ل سەر هەوە نەبوو، ب تنێ من هوون داخواز کربوون و هوون د داخوازا من هاتن، ڤێجا هوون لۆمەیێ ل خوە بکەن و ل من نەکەن، ئەڤرۆ ئەز چو مفایی ناگەهینمە هەوە و هوون ژی چو مفایی ناگەهیننە من، و ئەز باوەرییێ ب وێ شرکێ نائینم ئەوا هەوە ب خودێ کری، و زۆردار دێ گەهنە ئیزایەکا ب ئێش.

و ئاشکەرایە هەر مرۆڤەکێ تێگەهشتی بت و دووماهییەکا باش بۆ خوە بڤێت ئێکا هند ناکەت کو بگەهتە ڤێ پاشەڕۆژا خراب.

**دان و ستاندن:**

١- هزرا خوە د ئایەتا (٢٢)یێدا ژ سۆرەتا (إبراهیم) بکە، و ڕۆلێ شەیتانی د چاندنا گومانێدا د دلێ مرۆڤیدا ئاشکەرا بکە.

٢- تە چ مفا ژ ڤێ دان و ستاندنێ دیت؟

# مرۆڤ و هلبژارتنا ڕێکێ

قورئان و فەرمۆدەیێن پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) وێ چەندێ دگەهینن کو ئەگەرا سەرەکی یا کرنا گونەهان مرۆڤ ب خوەیە، لەو چو مرۆڤ نەشێن ڕۆژا دووماهییێ گونەهێن خوە ب ستوییێ شەیتانی ڕادەن، و خوە ژێ قورتال بکەن، مرۆڤ دبنە دو دەستەك: دەستەکەکێ بەر ل خودێیە و کارێ چاك و سەرفرازییێ دخوازت، و دەستەکەکا دی نزمی و کارێ خراب دڤێت، خودایێ مەزن دبێژت: ((**إِنَّا هَدَيْنَاهُ السَّبِيلَ إِمَّا شَاكِراً وَإِمَّا كَفُوراً**)) (الإنسان: ٣) ئانکو: مە بەرێ مرۆڤان داییە ڕێکا ڕاست، ڤێجا هندەك ژ وان قەستا ڕێکا ڕاست دکەن و سوپاسیا خودێ دکەن، و هندەك ڕێ ل بەر خوە بەرزە دکەن و سوپاسییا قەنجییا خودێ ناکەن. و خودایێ مەزن دووماهییا هەردو دەستەکان ئاشکەرا کرییە، و وی ڕێ یا داییە مرۆڤان کو ئەو وێ ڕێکێ بۆ خوە هلبژێرن یا وان دڤێت، و کەسەك یان چو هێز نەشێن کۆتەکییێ ل وان بکەن، چونکی د ئیسلامێدا مرۆڤ یێ ئازادە باوەرییێ بینت، و چو کۆتەکی د وێدا نینە، و مرۆڤ ب کەیفا خوە و ب ئازادی ڕێکا ژیانا خوە هلدبژێرت، بەلێ ل سەر وی فەرە بزانت کو هلبژارتن بەرپسیارییە، و خودێ سەرا هلبژارتنا وی دێ حسێبێ د گەل کەت.

خودایێ مەزن دبێژت: ((**وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ**)) (الکهف: ٢٩) ئانکو: تو بێژە وان: هەقی ژ خودایێ هەوەیە، و هەچییێ بڤێت بلا باوەرییێ بینت، و هەچییێ بڤێت بلا کافر ببت.

بۆ هلبژارتنا ڕێکا ژیانا خوە دڤێت مرۆڤ یێ هووربین بت، و باش هزرا خوە بکەت؛ چونکی پاشەڕۆژا وی ل دنیایێ و ئاخرەتێ ژی ب وێ چەندێڤە یا گرێداییە، و یا باش ئەوە ئەو پسیارا خوە ب زانا و چاکان بکەت؛ دا یا باشتر بۆ خوە هلبژێرت.

ئاشکەرایە کو ڕێکا خرابی و گونەهان یا ب ساناهییە، هەر چەندە هندەك نەخوەشی تێدا هەنە ژی، بەلێ ئەگەر مرۆڤ ب هۆش و عەقلداری هزرا خوە د وێ پاشەڕۆژێدا بکەت یا ل بەراهییا وی، ئەو دێ ڕێکا سەرفرازییێ هلبژێرت؛ چونکی دلخوەشی تێدایە، و پاشەڕۆژا مرۆڤی ل ڕۆژا دووماهییێ ب بڕیارەکا ویڤە یا گرێدایە، بڕیارەکە دڤێت ئەو ب هزر و عەقلداری هلبژێرت،

و دان و ستاندنێ ل دۆر مەسەلێ بکەت، و خوە ئێکدل بکەت و بڕیارێ بدەت، دا ئەو ڕێکا باوەرییێ و خێرێ و هاریکارییێ و بلندی و سەرفرازییێ هلبژێرت.

**پسیار:**

ئەگەر کارێ مرۆڤی لێگەڕیان و پسیار بت دا ئێك ژ دو ڕێکان هلبژێرت، ئەرێ ئەو ئەگەرێن وی پال ددەن کو ڕێکا باوەرییێ و سوپاسییا خودێ هلبژێرت، چنە؟

**دان و ستاندن:**

ڕۆلێ هەڤالی د سەرڕاستکرن و سەردابرنا مرۆڤیدا چیە؟

## مرۆڤ و کۆمەکا سالۆخەتێن گرنگ

خودایێ مەزن سەرمالەکێ گرنگ دایییە مرۆڤی، هاریکارییا وی دکەت کو ئەو رێکا ڕاست ببینت، و لێ بچت، ئەو ژی ئەڤەیە:

**١- خوەڕستی (الفطرة):**

مرۆڤ ب خوەڕست و سروشتێ خوە خودایێ خوە دناست، و بەرێ خوە ددەتێ، و وی دبینت ژێدەر بۆ قەنجی و پاکی و جوانییێ، و د کووراتییا دلێ ویدا هەستەك هەیە وی بۆ ناسین و پەرستنا خودێ دکێشت، و هەر مرۆڤەکێ دئێتە سەر دنیایێ ئەڤ هەستە د گەل هەیە، بەلێ خێزان و جڤاك و عەدەت وێ هەستێ ل نك مرۆڤی کێم دکەن و ناهێلن وەرارێ بکەت، و ژیانا مرۆڤی ب پەرستنا خودێ و ڤیانا وی و باوەرییێ ڕۆن ببەت.

**٢- پێگیری ب بهایێن پیرۆز:**

خودایێ مەزن ژێدەرێ جوانی و بهاییێن بلندە، و پشتی باوەری جهێ خوە د دلێ مرۆڤیدا دکەت، و وی تژی دکەت ژ ڤیانا خودایی، ئەو پێگیرییێ ب هندەك بهایێن بلند و جوان دکەت، وەکی: دلۆڤانی، کەرامەت، ڕاستگۆیی، دادی، لێبۆرین، و سنگفرەهییێ، و سالۆخەتێن خراب وەکی: دلڕەشی و دوڕوياتی و زۆردارییێ.. جهێ خوە د دلێ ویدا نابینن.

**٣- وژدانا ئەخلاقی:**

خودایێ مەزن ب وژدانێ منەت ل مرۆڤی کرییە، و وژدان ئەو هەستە ئەوا نەهێلت مرۆڤ کارەکێ بێ ڕەوشت بکەت، و ئەگەر هات و وی گونەهەك کر ژی وژدانا وی دێ وی ئێشینت و پال دەت کو ئەو ب کارەکێ چاك وێ خرابییێ ژێ ببەت.

**٤- هێزا هزرکرنا عەقلی:**

مەژی (عەقل) منەتەکا مەزنە خودێ ل مرۆڤی کری، و عەقلە باشی و خرابییێ نیشا مرۆڤی ددەت، و ئێکا هند ژ وی چێ دکەت کو ئەو جوانی و کرێتییێ ژێك جودا بکەت، ئیمام عەلی (خودێ ژێ ڕازی بت) بەحسێ عەقلی دکەت، و دبێژت: **(ئەو پەیامهلگرێ**

**ڕاستییێیە، و هەڤال و ڕێبەرێ مرۆڤییە، و ڕزگارکەر ونێزیککەرێ وییە ژ خودێ، و ئەو بهاترین سامانە ل نک مرۆڤی).**

و ئەگەر مرۆڤ مەژییێ خوە بدەتە کاری، و هزرا خوە د ئەنجامێ کارێن خوەدا بکەت، و بزانت چ تشت بۆ وی و خێزان و جڤاکا وی یێ باشە، ئەو ب ساناهی دێ ب ڕێکا ڕاست کەڤت، و ناکەڤتە بن کارلێکرنا حەزێن خراب، لەو ئەوێن ڕۆژا ڕابوونێ ژ بەر خرابییێن خوە دچنە ئاگری دبێژن: ((وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ)) (الملك: ١٠) ئانکو: ئەگەر مە شیابا گوهدارییا هەقییێ بکەین، و مەژییێ خوە دورست بدەینە کاری، ئەم نەدبووینە ژ دۆژەهییان (جەهنەمییان).

و د گەل ڤان هێزێن ناڤخوەیی ئەوێن د دل و وژدانا مرۆڤیدا هەین، و بەرێ وی ددەنە ناسینا خودایێ پەروەردگار، خودێ پێغەمبەرێ خوە ژی (سلاڤ لێ بن) بۆ هاریکارییا مرۆڤان هنارت؛ دا پەیاما خودێ بگەهینتە وان، و بەرێ وان بدەتە ڕێکا ڕزگاری و دلخوەشییێ.

ڤێجا ئەگەر مرۆڤی مفا ژ وان هێزان دیت یێن د دل و وژدانا ویدا هەین، و ژ پەیامێن پێغەمبەرێن خودێ، جوانی و شرینییا (باوەرێ) و (کارێ چاك) دێ چتە د دلێ ویدا، و ڕەنگدانا وێ چەندێ ل سەر ژیانا وی دێ هەبت، و ئەو دێ هەست ب خوەشییێ کەت و دلێ وی دێ تەنا بت.

**پسیار:**

١- هندەك سالۆخەتێن گرنگ بۆ مرۆڤی دیار بکە.

٢- ئەڤێ ئایەتا پیرۆز شرۆڤە بکە ((وَقَالُوا لَوْ كُنَّا نَسْمَعُ أَوْ نَعْقِلُ مَا كُنَّا فِي أَصْحَابِ السَّعِيرِ)). (الملك: ١٠)

## ئەم دێ کیڤە چین؟

مە زانییە کو خودایێ مەزن ئەم ئافراندینە، دەمەکی ئەم دێ زێندی بین، پاشی دێ مرین، و ل خودایێ خوە زڤڕین، لەو دڤێت ئەم تێگەهشتنا خوە بۆ ژینێ و مرنێ و پشتی مرنێ بەرفرەهـ بکەین، ومرۆڤان ب ڕەنگەکێ گشتی دو بۆچوون ل دۆر مرنێ هەنە.

**بۆچوونا ئێکێ:**

خودانێن ڤێ بۆچوونێ هزر دکەن کو مرن دووماهییا ژیانێیە، و پشتی ژییێ مرۆڤی دچت ژیان ب دووماهی دئێت، و ئەو بۆ جیهانا نەمانێ دئێتە سپارتن، و خودانێن ڤێ بۆچوونێ دو هەلوێست بەرانبەر مرنێ هەنە:

أ- هندەك ژ وان نەشێن هزرێ د مرنێدا نەکەن، لەو دەمێ بیرا وان ل هندێ دئێتەڤە کو مرن دووماهییا وانە، ئەو بێ هێز و نەڕەحەت دبن، و تووشی دودلییێ دبن.

ب- و هندەکێن دی ڤێ چەندێ ژ بیرا خوە دبەن، و نەڤێن هزرێ تێدا بکەن، دا ئەو ب ڤێ ژ بیرکرنێ خوە ژ هزرا مرن و نەمانێ بپارێزن، کو - ب دیتنا وان - ئەو هزرەکا نەخوەشە.

**ئەنجامێ بۆچوونا ئێکێ:**

ژ ئەنجامێن بۆچوونا ئێکێ ئەوە ژیانا مرۆڤی بێ ئارمانج دگەهتە دووماهییێ، و هەمی دەرگەهێن هیڤییێ ل بەر سنگێ وی دئێنە گرتن، و ئەڤە دبتە ئەگەرا هندێ کو هندەك ژ وان تووشی ئێشێن دەروونی ببن، و ژیانا وان ببتە دۆژەهـ، و هندەك ژ وان خوە ب هندەك کارێن وەساڤە مژوول دکەن کو مرن ژ بیرا وان بچت، بەلێ ئەڤ چەندە مفایی ناگەهینتە وان، خودایێ مەزن دبێژت: ((**قُلْ هَلْ نُنَبِّئُكُمْ بِالْأَخْسَرِينَ أَعْمَالاً ﴿١٠٣﴾ الَّذِينَ ضَلَّ سَعْيُهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ يَحْسَبُونَ أَنَّهُمْ يُحْسِنُونَ صُنْعاً ﴿١٠٤﴾ أُولَئِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا بِآيَاتِ رَبِّهِمْ وَلِقَائِهِ فَحَبِطَتْ أَعْمَالُهُمْ فَلَا نُقِيمُ لَهُمْ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَزْناً ﴿١٠٥﴾**)) (الكهف: ١٠٣-١٠٥) ئانکو: ئەرێ هەوە دڤێت ئەز بۆ هەوە بێژم کانێ کیژ مرۆڤ ژ هەمییان پتر یێ زیانکارە، ئەو ئەون، ئەوێن باوەری ب ئایەتێن خودێ نەئینایین، و باوەری نەئینایین کو ئەو دێ

زڤڕنە نك خودێ، لەو كەدا وی د دنیاییێدا پووچبوو، و ل ڕۆژا دووماهییێ وان چو سەنگێ خوە نابت.

## ڤەكۆلان:

١- ئەو چ مەیلا دەروونییە هندێ ژ ڤان هەردو دەستەكان چێ دكەت كو ئێك ژ وان گرنگییێ نەدەتە مرنێ، و یا دی گەلەك ژ مرنێ بترست هەتا بێزار ببت؟

٢- ئەرێ تو بێژی ئەوێن مرن ژ بیرا خوە برین، وان ڕێكا ڕاست هلبژارتبت؟ ئەگەر بەرسف (بەلێ) بت، بۆچ؟

٣- ئەو چ شوونوارن ئەڤ هزرە یان ئەڤ دیتنە ل سەر ژینا مرۆڤی دهێلت؟

و نهۆ دا بەرێ خوە بدەینێ كانێ قورئان چ بەحسێ بۆچوونا ئێكێ بۆ مە دكەت.. خودایێ مەزن دبێژت: ((وَعْدَ اللَّهِ لاَ يُخْلِفُ اللَّهُ وَعْدَهُ وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لاَ يَعْلَمُونَ ﴿٦﴾ يَعْلَمُونَ ظَاهِراً مِّنَ الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَهُمْ عَنِ الْآخِرَةِ هُمْ غَافِلُونَ ﴿٧﴾ أَوَلَمْ يَتَفَكَّرُوا فِي أَنفُسِهِمْ مَا خَلَقَ اللَّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا إِلَّا بِالْحَقِّ وَأَجَلٍ مُّسَمًّى وَإِنَّ كَثِيراً مِّنَ النَّاسِ بِلِقَاءِ رَبِّهِمْ لَكَافِرُونَ﴿٨﴾)) (الروم: ٦-٨) ئانكو: ئەو د ڕامانێن سەرڤە یێن ژیانێ ب تنێ دگەهن، و ژ ڕۆژا دووماهییێ بێ ئاگەهن، ئەرێ ما ئەڤنە هزر ناكەن كو ئەو و ئەسمان و ئەرد و هەر تشتەكێ د ناڤبەرا واندا ژ قەستا نەهاتینە ئافراندن، بەلكو دەمەكێ دەستنیشانكری وان هەیە؟

د گەل ڤێ چەندێ گەلەك مرۆڤ هەنە باوەر ناكەن كو ئەو دێ زڤڕنە نك خودێ، خودایێ مەزن دبێژت: ((إِنَّ فِي اخْتِلاَفِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَمَا خَلَقَ اللَّهُ فِي السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ لآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَّقُونَ ﴿٦﴾ إِنَّ الَّذِينَ لاَ يَرْجُونَ لِقَاءنَا وَرَضُواْ بِالْحَياةِ الدُّنْيَا وَاطْمَأَنُّواْ بِهَا وَالَّذِينَ هُمْ عَنْ آيَاتِنَا غَافِلُونَ ﴿٧﴾ أُوْلَـئِكَ مَأْوَاهُمُ النُّارُ بِمَا كَانُواْ يَكْسِبُونَ ﴿٨﴾)) (یونس: ٦-٨) ئانكو: ئەوێن هیڤییا دیتنا مە نەكەن، و ب ژینا دنیایێ ڕازی بووین و ڕۆژا دووماهییێ ژ بیركرین، و ژ ئایەتێن خودێ بێ ئاگەه مایین، دووماهییا وان دۆژەهە ژ بەر وان گونەهێن وان كرین.

هزر بكە:

هزرا خوە د ئایەتێن بۆرین دا بكە و چەند خالان ل دۆر بۆچوونا ئێكێ ژێ دەربێخە.

## بۆچوونا دویێ:

ب بۆچوونا ڤان کەسان، کو دووکەڤتییێن ئایینێن ئەسمانینە، مرن نە دووماهییا ژیانێیە، بەلکو ئەو وەکی ئاڤابوونا ڕۆژێیە، ئەوا سوباهی گەشتر دهلێت، و مرن ب بۆچوونا مرۆڤێ باوەردار دەستپێکا بوونەکا نوویە، و ب مرنێ نەمانا هەر و هەر ناگەهتە مرۆڤی، بەلکو ئەو ژ جیهانەکێ دچتە جیهانەکا دی یا بلندتر، و باوەردار مرنێ وەك قۆناغا ڤەگوهاستنێ دهەژمێرت بەر ب نەمری و ژینا بەردەوامڤە، لەو دەمێ ئەو هزرا مرنێ دکەن ئەو بێزار نابن، تشتێ هندێ دگەهینت کو مرۆڤ یێ هاتییە ئافراندن دا بمینت، نە دا بچت و نەمینت، و مرن ب تنێ مە ژ جیهانەکێ دبەتە جیهانەکا دی.

و هزرکرنا د مرنێدا ل نك باوەرداری نە بۆ ترس و سەهمێیە، بەلکو ئەو بۆ زێدەکرنا کارێن چاکە، دا ل ڕۆژا دووماهییێ خێر بگەهنە وی. ب ڤێ چەندێ باوەری ب خودێ و ئایینێن ئەسمانی، و ب تایبەتی ئیسلامێ، هاریکارییا مە دکەت کو ئەم د ڕاستییا مرنێ بگەهین، و وێ بۆ خوە بکەینە پالدەرەکێ مەزن کو ژینەکا باشتر ل دنیایێ و ئاخرەتێ بژین.

### ئەنجامێن بۆچوونا دویێ:

١- ئێکەمین ئەنجامێ ڤێ بۆچوونێ ئەوە دەرگەهێ هیڤییێ ڤەدبت، و بێ هیڤیبوون و ڕەشبینی ژ مرۆڤی دئێتە دوورکرن.

٢- ئەو مرۆڤی بۆ کار و چالاکی و کاریگەرییێ پالددەت، دا کو ژیانا خوە و یا جڤاکێ باشتر لێ بکەت، و مرۆڤێ ب ڤی ڕەنگی هێزەکا مەزن و ئیرادەیەکا ب هێز و خیرەتەکا بلند بۆ جهئینانا کاران دێ هەبت، و ئەو هەست ب وەستیانێ ناکەت و خوەشییێ ژ کاری دبینت، و ب هەمی هێز و شیانا خوە ئەو خزمەتا خەلکێ دی دکەت و کاری بۆ دلخوەشییا وان دکەت، چونکی ئەو دزانت کو دووماهییا وی یا خوەشە، و کارێ ڤان ڕەنگە مرۆڤان نە بۆ وان ب تنێیە، بەلکو بۆ هەمی کوڕێن جڤاکێیە.

٣- ژ شوونوارێن دی یێن ڤێ بۆچوونێ ئەوە باوەردار ژ مرنێ ناترست، بەلکو ب کرنا کاری د ڕێکا خودێدا ئەو بۆ مرنێ خوە ئامادە دکەت، و خوداپەرێس د ڤێ دنیایێدا دلخوەش دژین، بەلێ ئەو دنیایێ ناپەرێسن، و ئەو مرنێ حسێب ناکەن بەلایەکا مەزن؛ چونکی مرن بۆ وان کەسان بەلایە ئەوێن ب بارەکێ گرانێ گونەهانڤە دزڤڕنە نك خودێ، و ڕامانا ڤێ ئەو نینە کو خوداپەڕێس حەز ژ مرنێ دکەن، چونکی خودایێ مەزن مرۆڤ ب ڤی ڕەنگی نەئافراندییە، و ئەو ژ ژینێ ژی نارەڤت، چونکی ئەو دزانت خودایێ مەزن مرۆڤ داییە دا ئەردی ئاڤا بکەت، و ئەو دوعایێ ژ خودێ دکەت کو ژیيەکێ درێژ بدەتێ د گەل ساخلەمییێ و کارێ چاك، دا هەتا دووماهییێ ئەو بۆ خێر و دلخوەشییا خوە و یا کەسێن ل دەور و بەرێن خوە ژی بژیت، و خزمەتا وان بکەت، و ب ڕوویەکێ گەش و دلەکێ خوەشڤە ل خودایێ خوە بزڤڕت.

ژ بەر ڤێ چەندێ ئیسلام دورست ناکەت کەسەك - ژ بلی ژنێ ل سەر مێری - پتر ژ سێ ڕۆژان ل سەر کەسەکێ دی یێ ب نیهار (شینی ) بت، و ئەو کەسێن هندەك مرۆڤێن وان دمرن دڤێت ژیانا خوە یا ئاسایی ببەنە سەری، چونکی ئیسلام نە ئەو ئایینە ئەوێ حەز ژ مرنێ دکەت، بەلکو ئەو حەز ژ ژین و دلخوەشییێ دکەت.

دەمێ مرۆڤێ باوەردار ژ مرنێ نەترست، هنگی ئەو دێ شێت ڕاستییان گەهینت و ئاشکەرا کەت، و ل بەر سنگێ زۆرداران ڕاوەستت، ب ڕێکا خەباتێ پێخەمەتی بنەجهکرنا دادی و ئازادییێ د ناڤبەرا خەلکیدا.

**پسیار:**

١- ئەنجامێن بۆچوونا دویێ دیار بکە.

٢- کەنگێ مرۆڤ دێ شێت ڕاستییا نەگەهینت؟

# جیهانا ئەڤرۆ و بێ ئاگەهی ژ ڕۆژا دووماهییێ

پتربیا مرۆڤان ل جیهانا مە یا ئەڤرۆ باوەری ب خودێ و ڕۆژا دووماهییێ هەیە، بۆ نموونە: وەلاتەکێ وەکی ئەمریکا ڕێژەیا باوەرداران پترە ژ (٩٠٪)، و هەمی ئایینێن ئەسمانی ل سەر بناخەیێ باوەری ب خودێ و ڕۆژا دووماهییێ هاتینە دانان.

بەلێ پسیار ئەڤەیە: ئەرێ باوەری ب ڕۆژا دووماهییێ کار ل ژینا مرۆڤان کرییە؟ و وان پسیار ژ خوە کرییە کو ئەگەر ڕۆژەك هەبت ئەو تێدا ڕاببنەڤە و خودێ حسێبێ د گەل وان بکەت، دڤێت ئەو چاوا بژین؟ و ئەڤ باوەرییە دێ چییێ ژ ژینا وان گوهۆڕت؟

ب ڕاستی هەر چەندە گەلەك مرۆڤ باوەرییێ ب ڕۆژا دووماهییێ دئینن و حاشاتییێ لێ ناکەن ژی، بەلێ ئەو خوە ژێ بێ ئاگەهـ دکەن، و ئەڤە هندێ دگەهینت کو باوەرییا هندەك مرۆڤان نە ژ دلییە، لەو چو شوونوارێن وێ ل ژیانا وان دیار نابن.

زانا ئەڤرۆ پسیار دکەن: ئەرێ بۆچ د گەل وێ پێشکەڤتنا زانستی و تەکنۆلۆژی یا مرۆڤی ب دەست خوەڤە ئینایی ژی بەلێ ڕەنگەکێ نەهەڤسەنگی و دلتەنگییێ د ژینا پتربیا مرۆڤاندا هەیە؟ بۆچ ب ملیۆنان مرۆڤ برسی و بێ مال دژین د گەل وان هەمی خێر و بێرێن ل ئەردی هەین و کێم مرۆڤ مفایی ژێ دبینن؟ بۆچ ئەڤ هەمی شەڕ و بازرگانییا ب چەکی و مرۆڤی و ماددەیێن بێ هۆشکەر هەیە؟

بۆچ دڤێت ئەڤ هەڤرکی د ژینا مرۆڤیدا هەبن ل دەمێ زانست و تەکنۆلۆژیاییێ؟ ئەرێ ما ئەگەر نە بێئاگەهییا مرۆڤییە ژ ڕۆژا دووماهییێ، یان لاوازییا باوەرییا وییە؟

قورئان وێنەیێ ژینا هندەك مرۆڤان بۆ مە بەرچاڤ دکەت کو ئەو نە ل هیڤییا ژینەکا باشترن ل ئاخرەتێ، خودێ دبێژت: ((**الَّذِينَ اتَّخَذُواْ دِينَهُمْ لَهْواً وَلَعِباً وَغَرَّتْهُمُ الْحَيَاةُ الدُّنْيَا فَالْيَوْمَ نَنسَاهُمْ كَمَا نَسُواْ لِقَاء يَوْمِهِمْ هَـذَا وَمَا كَانُواْ بِآيَاتِنَا يَجْحَدُونَ**)) (الأعراف: ٥١) ئانکو: ئەوێن یارییان ب دینی دکەن و دیدارا خودایێ مەزن ژ بیرکری، ئەو ژی ڕۆژا دووماهییێ دێ وان ژ بیرکەت، چونکی وان ل دنیاییێ باوەری ب وان ئایەت و نیشانان نەدئینا.

## ڤەكۆلان و هزركرن:

١- هندەك مرۆڤ هەنە د گەل كو باوەرییێ ب ڕۆژا دووماهییێ دئینن ژی، بەلێ كاری بۆ هندێ ناكەن وێ ڕۆژێ سەركەڤتنێ ب دەست خوە بێخن.

٢- ئەرێ ما بێئاگەهی ژ ڕۆژا دووماهییێ وەكی پشتدانا ژینا دنیاییێیە؟

٣- ڤان ئایەتان بخوونە، پاشی وێ بۆچوونێ ئاشكەرا بكە ئەوا ئەڤ ئایەتە ل دۆر مرنێ دگەهینن:

((فَأَرْسَلْنَا فِيهِمْ رَسُولاً مِّنْهُمْ أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ أَفَلَا تَتَّقُونَ ﴿٣٢﴾ وَقَالَ الْمَلَأُ مِن قَوْمِهِ الَّذِينَ كَفَرُوا وَكَذَّبُوا بِلِقَاءِ الْآخِرَةِ وَأَتْرَفْنَاهُمْ فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا مَا هَذَا إِلَّا بَشَرٌ مِّثْلُكُمْ يَأْكُلُ مِمَّا تَأْكُلُونَ مِنْهُ وَيَشْرَبُ مِمَّا تَشْرَبُونَ ﴿٣٣﴾ وَلَئِنْ أَطَعْتُم بَشَراً مِثْلَكُمْ إِنَّكُمْ إِذاً لَّخَاسِرُونَ ﴿٣٤﴾ أَيَعِدُكُمْ أَنَّكُمْ إِذَا مِتُّمْ وَكُنتُمْ تُرَاباً وَعِظَاماً أَنَّكُم مُّخْرَجُونَ ﴿٣٥﴾ هَيْهَاتَ هَيْهَاتَ لِمَا تُوعَدُونَ ﴿٣٦﴾ إِنْ هِيَ إِلَّا حَيَاتُنَا الدُّنْيَا نَمُوتُ وَنَحْيَا وَمَا نَحْنُ بِمَبْعُوثِينَ ﴿٣٧﴾)) (المؤمنون: ٣٢-٣٧).

## پێشنیار:

١- ل ژینەنیگارا ئێك ژ سەركردە و خوداناسێن مەزن بزڤڕە، و بەرێ خوە بدێ كانێ وان چاوا بەرێ خوە ددا ژین و مرنێ؟

٢- ل شیرەتا سەركردەیێ شەهید قازی موحەممەد سەرۆكێ كۆمارا كوردستانێ بزڤڕە، و بەرێ خوە بدێ كانێ وی چاوا هزر د مرنێ و شەهیدبوونێدا دكر، وەك باوەردارەكێ خەباتكەر د ڕێكا دابینكرنا مافێن مللەتێ خوەدا؟

## بەلگەیێن هەبوونا ژینەکا باشتر
## ل جیهانەکا دی

گەلەك بەلگە هەنە هندێ دگەهینن کو ژیانەکا باشتر ل جیهانەکا دی هەیە، ئەوا دبێژنێ: ڕۆژا دووماهییێ..

و ل سەری دا ژ قورئانێ دەست پێ بکەین، دا بزانین کانێ خودایێ مەزن چاوا ڤێ مەسەلێ بۆ مە ئاشکەرا دکەت، خودایێ مەزن دبێژت: ((اللّهُ لا إِلَـهَ إِلاَّ هُوَ لَيَجْمَعَنَّكُمْ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ لاَ رَيْبَ فِيهِ وَمَنْ أَصْدَقُ مِنَ اللّهِ حَدِيثاً)) (النساء: ٨٧) ئانکو: ژ خودێ پێڤەتر چو خودایێن دورست نینن، و ئەوە یێ کو ل ڕۆژا ڕابوونێ دێ هەوە کۆم کەت، و ئەو د ژڤانێ خوە دا یێ ڕاستگۆیە.
هەر وەسا دبێژت: ((أَفَحَسِبْتُمْ أَنَّمَا خَلَقْنَاكُمْ عَبَثاً وَأَنَّكُمْ إِلَيْنَا لَا تُرْجَعُونَ ﴿١١٥﴾ فَتَعَالَى اللَّهُ الْمَلِكُ الْحَقُّ لَا إِلَهَ إِلَّا هُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْكَرِيمِ ﴿١١٦﴾)) (المؤمنون: ١١٥-١١٦) ئانکو: ئەرێ هوون هزر دکەن کو مە هوون ژ قەستا ئافراندینە، و هوون نازڤڕنە نك مە؟ سەرفڕازی و بلندی بۆ خودێ ب تنێ بن خودایێ عەرشێ بلند.
و دبێژت: ((وَمَا خَلَقْنَا السَّمَاء وَالْأَرْضَ وَمَا بَيْنَهُمَا بَاطِلاً ذَلِكَ ظَنُّ الَّذِينَ كَفَرُوا فَوَيْلٌ لِّلَّذِينَ كَفَرُوا مِنَ النَّارِ﴿٢٧﴾ أَمْ نَجْعَلُ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ كَالْمُفْسِدِينَ فِي الْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ الْمُتَّقِينَ كَالْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾)) (ص: ٢٧-٢٨) ئانکو: ئەسمان و ئەرد و تشتێ د ناڤبەرێدا مە ژ قەستا نەئافراندینە، ئەو هزرا بێباوەرانە، و چ خرابە حالە بۆ وان دەمێ ئەو بۆ ئاگری دئێنە ئاژۆتن، و ئەرێ ما ئەم وان یێن باوەری ئینای و چاکی کرین دێ وەکی وان لێ کەین یێن خرابی د ئەردیدا کرین، یان دێ تەقواداران وەکی گونەهکاران لێ کەین؟

ئەڤ ئایەتە ئارمانجا هەبوونا مرۆڤی ل سەر ئەردی، و ئافراندنا ئەسمانان و ئەردی دکەتە بەلگە ل سەر هەبوونا ڕۆژا دووماهییێ، ب ڕامانەکا دی: نەباوەری ئینان ب ڕۆژا دووماهییێ وەکی وێیە مرۆڤ بێژت: چو مفا و ئارمانج د هەبوونا گەردوونی و ژیانێدا نینە، و ئەو هەمی هندەك تشتێن بێخێرن و هەما ئەو ب خوە، خوە ب ڕێڤە دبەن، و گومان تێدا نینە هەر مرۆڤەکێ دورست هزر بکەت ڤان گۆتنێن بێ بها نابێژت.

## هزرکرن د ئایەتاندا:

هزرا خوە د ئایەتێن بۆریدا بکە، و بەرێ خوە بدێ کانێ چ وانە و پەیامێ دگەهینن.

## مەژییێ مرۆڤی و ژڤانێ پێغەمبەران

دەمێ مرۆڤ دکەڤتە دەراڤەکێ ب ترس مەژییێ وی، وی لێ هشیار دکەت و ژێ دخوازت ئەو خوە ژێ بدەتە پاش، بۆ نموونە: ئەگەر تێلەکا کارەبێ یا ڕویس ب دیوارێ مالێڤە هەبت، و کەسەك مە بترسینت کو دەستێ خوە بکەینێ چونکی دبت کارەب تێدا هەبت، ئەم دەستێ خوە ناکەینێ، هەر چەندە دبت ئەو گۆتن یا دورست نەبت ژی، و ژیانا دووماهییێ ئەوا دبت ببتە جهێ دلخوەشییەکا بەردەوام یان بەخترەشییەکا هەروهەر، مەژی ژ مە دخوازت ئەم ب مجدیڤە وەربگرین، ل وی دەمێ کو پێغەمبەرێن خودێ هەمییان بەرێ مرۆڤان داییە هندێ  کو وان باوەری ب ژینا دووماهییێ هەبت، چونکی باوەری ب ڕۆژا دووماهییێ پشکەکا تەمامکەرە بۆ باوەری ب خودێ، و د قورئانا پیرۆزدا ب ڕەنگەکێ ڕۆن و ئاشکەرا بەحسێ ڕۆژا دووماهییێ دئێتە کرن، کو چو گومان د دلیدا نەمینت، و قورئانا پیرۆز باوەرییێ ب ڕۆژا دووماهییێ پشتی باوەرییێ ب خودێ دئینت.

## هزرکرن:

دەمێ ئەم دبینین پێغەمبەران -و ئەو ژ هەمی مرۆڤان ڕاستگۆترن- بەحسێ ڕۆژا دووماهییێ کرییە، ئەرێ چ بڕیارا دورست هەیە دڤێت ئەم وەرگرین، و ژ لایێ عەقلیڤە چاوا سەرەدەرییێ د گەل بکەین؟

## ڕۆژا دووماهییێ ل بەردەستێ دادییا خودایی:

دادی ئێك ژ سالۆخەتێن خوداییە، و خودایێ مەزن دادوەرە، و وی گەردوون هەمی ل سەر بناخەیێ دادییێ دانایە، و ژ بەر ڤێ چەندێ خودایێ مەزن سۆز داییە کو ئەو دادییێ بکەت دا هەر کەسەك بارا خوە وەرگرت و مافێ کەسێ نەئێتە خوارن، و ژینا دنیایێ ب تبیعەتێ خوە نە جهێ کارئینانا ڤێ دادییا خوداییە، چونکی:

أ- ژییێ مرۆڤی کورتە، و گەلەك مرۆڤ هەنە هێشتا بەرهەمێ کارێ خوە نەدیتین وەغەر دکەن.

ب- گەلەك کار هەنە د شیانا مرۆڤیدا نینە، خێرا وان د دنیاییێدا بێتە دان، وەکی: خێرا شەهیدبوونێ.

ج- خێرا وی مرۆڤی ئەوێ گەلەك خزمەتا مرۆڤان دکەت، و ژ بەر کورتییا ژییێ وی د دنیاییێدا بۆ وی نائێتە دان.

د- جزادانا وان کەسێن زۆرداری ژی ل خەلکی کرین، وەکی کەسێ گەلەك مرۆڤ کوشتین، د ڤێ دنیاییێدا ب جه نائێت.

هـ- ژ بەر زۆرداریا هندەك مرۆڤان، رێیا پێشکەڤتن و سەرکەڤتنێ ل هندەکێن دی دئێتە گرتن، و گەلەك نەخوەشی دگەهتە وان، و بۆ زانین ئەڤ چەندە د دنیاییێدا ل سەر وان حسێب نابت.

ژ بەر ڤێ چەندێ:

ئێك: مرۆڤ نەشێن د ڤێ دنیاییێدا بەرهەمێ کارێ خوە ب دورستی وەرگرن.

دو: د شیانا مرۆڤیدا نینە، کو د دنیاییێدا بۆ وان کەسان بێتە بەدەلڤەکرن ئەوێن زۆرداری لێ هاتییە کرن.

## ئینانا بەلگەیان:

ل بەر سیبەرا چەندا مە گۆتی، پێدڤیا هەبوونا ژینا دووماهییێ ئەوا ل سەر بناخەیێ دادییا خودایی ئاڤاکری، ب بەلگە ئاشکەرا بکە.

## مالا دووماهییێ

ئەرێ مرۆڤ پشتی مرنێ ئێکسەر دچنە جیهانا دی، یان هندەك قۆناغێن دی هەنە دڤێت ئەو تێرا ببۆرن بەری دەستپێکرنا ژیانێ ل وێ جیهانا دی؟ ئەرێ د وێ قۆناغێدا ئەوا پشتی مرنێ دئێت مرۆڤێ بێ ئاگەهە یان نە؟

بەری هەر تشتەکی دا بەرێ خوە بدەینە ڤێ چەندێ وەکی ئایەت بەحس ژێ دکەن، دا بزانین کانێ مالا دووماهییێ یا مرۆڤی ل کیڤەیە؟ و دێ چ ئێتە سەری؟ و هەلوێستێ مرۆڤان ژ ڤێ چەندێ چیە؟

١- خودایێ مەزن دبێژت: ((حَتَّى إِذَا جَاء أَحَدَهُمُ الْمَوْتُ قَالَ رَبِّ ارْجِعُونِ ﴿٩٩﴾ لَعَلِّي أَعْمَلُ صَالِحًا فِيمَا تَرَكْتُ كَلَّا إِنَّهَا كَلِمَةٌ هُوَ قَائِلُهَا وَمِن وَرَائِهِم بَرْزَخٌ إِلَى يَوْمِ يُبْعَثُونَ ﴿١٠٠﴾ فَإِذَا نُفِخَ فِي الصُّورِ فَلَا أَنسَابَ بَيْنَهُمْ يَوْمَئِذٍ وَلَا يَتَسَاءلُونَ ﴿١٠١﴾ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ ﴿١٠٢﴾ وَمَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ الَّذِينَ خَسِرُوا أَنفُسَهُمْ فِي جَهَنَّمَ خَالِدُونَ ﴿١٠٣﴾ تَلْفَحُ وُجُوهَهُمُ النَّارُ وَهُمْ فِيهَا كَالِحُونَ﴿١٠٤﴾ أَلَمْ تَكُنْ آيَاتِي تُتْلَى عَلَيْكُمْ فَكُنتُم بِهَا تُكَذِّبُونَ ﴿١٠٥﴾ قَالُوا رَبَّنَا غَلَبَتْ عَلَيْنَا شِقْوَتُنَا وَكُنَّا قَوْمًا ضَالِّينَ ﴿١٠٦﴾ رَبَّنَا أَخْرِجْنَا مِنْهَا فَإِنْ عُدْنَا فَإِنَّا ظَالِمُونَ ﴿١٠٧﴾ قَالَ اخْسَؤُوا فِيهَا وَلَا تُكَلِّمُونِ ﴿١٠٨﴾ إِنَّهُ كَانَ فَرِيقٌ مِّنْ عِبَادِي يَقُولُونَ رَبَّنَا آمَنَّا فَاغْفِرْ لَنَا وَارْحَمْنَا وَأَنتَ خَيْرُ الرَّاحِمِينَ ﴿١٠٩﴾ فَاتَّخَذْتُمُوهُمْ سِخْرِيًّا حَتَّى أَنسَوْكُمْ ذِكْرِي وَكُنتُم مِّنْهُمْ تَضْحَكُونَ ﴿١١٠﴾ إِنِّي جَزَيْتُهُمُ الْيَوْمَ بِمَا صَبَرُوا أَنَّهُمْ هُمُ الْفَائِزُونَ ﴿١١١﴾)) (المؤمنون: ٩٩-١١١).

ئانکو: هەتا دەمێ مرن دگەهتە ئێك ژ وان کافران، ئەو دبێژت: خودایێ من تو من بزڤڕینە دنیایێ. دا بەلکو ئەز ل خوە بزڤڕم و کارێ چاك بکەم. ئەو تشت بۆ وی نابت. وهەما ئەو ئاخڤتنەکە ئەو بۆ خوە دبێژت، و د ناڤبەرا وی و دنیاییێدا پەردەیەك هەیە ناهێلت ئەو بزڤڕتەڤە هەتا ڕۆژا قیامەتێ. دەمێ بۆڕی هاتە لێدان، و مرۆڤ ژ گۆڕێن خوە ڕابوونەڤە، هنگی شانازیبرنا ب باب و باپیران یا وان د دنیایێ دا دکر نابت، و کەس پسیارێ ژ کەسێ ناکەت. و هەچییێ خێرێن وی بوونە گەلەك و تەرازوویا کریارێن وی پێ گران بوو، ئەو ئەون بەهەشت ب دەست خوەڤە ئینایین. و هەچییێ خێرێن وی د تەرازوویێ دا کێم بوون، و گونەهێن وی پتر لێ هاتن، ئەو ئەون، ئەوێن زیان کرین و شەرمزار بووین، هەروهەر دێ د ئاگرێ دۆژەهێدا بن. ئاگر ڕوویێن وان دسۆژت،

و ئەو تێدا ناڤچاڤگرێنە، و بۆ وان دئێتە گۆتن: ئەرێ ما ئایەتێن قورئانێ د دنیاییێدا بۆ هەوە نەدهاتنە خواندن، وهەوە درەو پێ دکر؟ ئەو دێ بێژن: خودێوۆ، ژ بێ ئێغبالییا خوە ئەم د سەرداچووین، تو مە ژ ئاگری بینەدەر، ومە بزڤرینە دنیاییێ، و ئەگەر ئەم ل گونەهێ زڤڕین ئەو ئەم دهەژینە بێینە ئیزادان. خودێ گۆتە وان: هوون د ئاگریدا ڕەزیل بمینن و من نەئاخێڤن. نێ دەستەكەك ژ بەنیێێن من هەبوون دگۆتن: خودێوۆ، مە باوەری ئینا ڤێجا تو گونەهێن مە بۆ مە ڤەشێرە، و دلۆڤانییێ ب مە ببە، و تو چێترین دلۆڤانكاری. ڤێجا هەوە یاری بۆ خوە ب وان كرن، هەتا هەوە زكرێ من ژ بیركری، و هەوە ب وان دكرە كەنی. ڤێجا ژ بەر سەبركێشانا وان ل سەر نەخوەشییێ من ئەڤرۆ جزاییێ وان كرە بەهەشت؛ و ئەون سەركەڤتی.

٢- و خودایێ مەزن دبێژت: ((إِنَّ الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلآئِكَةُ ظَالِمِي أَنْفُسِهِمْ قَالُواْ فِيمَ كُنتُمْ قَالُواْ كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الأَرْضِ قَالْوَاْ أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُواْ فِيهَا فَأُوْلَئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءتْ مَصِيراً ﴿٩٧﴾ إِلاَّ الْمُسْتَضْعَفِينَ مِنَ الرِّجَالِ وَالنِّسَاء وَالْوِلْدَانِ لاَ يَسْتَطِيعُونَ حِيلَةً وَلاَ يَهْتَدُونَ سَبِيلاً ﴿٩٨﴾)) (النساء: ٩٧-٩٨).

ئانكو: ئەوێن زۆرداری ل خوە كرین دەمێ فریشتە جانێ وان دستینن، ب گەفكرنڤە دبێژنە وان: هوون د مەسەلا دینێ خوەدا د چ حالدا بوون؟ ئەو دێ بێژن: ئەم د ئەردێ خوەدا لاواز بووین، و مە نەدشیا زۆرداریێ و ستەمێ ژ خوە بدەینە پاش، ڤێجا فریشتە دێ بێژنە وان: ئەرێ ما ئەردێ خودێ یێ فرەهـ نەبوو كو هوون دەركەڤنە ئەردەكێ دی یێ زۆرداری لێ ل هەوە نەئێتەكرن؟ ئەوێن هە جهێ ڤەحەویانا وان ئاگرە، و ئەو پیسترین جهێ لێ زڤرینێیە. و ئەوێن دبێزار ژ مێر و ژن و زارۆكان یێن كو نەشێن زۆرداریێ و ستەمێ ژ خوە بدەنە پاش، و چو ڕێكان بۆ خوە نابینن كو پێ ژ نەخوەشییێ قورتال ببن، ئەو ناگەهنە ڤێ دووماهییا خراب.

٣- و خودایێ مەزن دبێژت: ((الَّذِينَ تَتَوَفَّاهُمُ الْمَلائِكَةُ طَيِّبِينَ يَقُولُونَ سَلامٌ عَلَيْكُمُ ادْخُلُوا الْجَنَّةَ بِمَا كُنْتُمْ تَعْمَلُونَ)) (النحل: ٣٢).

ئانكو: ئەوێن چاك دەمێ فریشتە جانێ وان دستینن، دبێژنێ: سلاڤ ل هەوە بن، هەڕنە بەهەشتێ ژ بەر كارێ باشێ هەوە كری.

٤- خودایێ مەزن دبێژت: ((فَوَقَاهُ اللَّهُ سَيِّئَاتِ مَا مَكَرُوا وَحَاقَ بِآلِ فِرْعَوْنَ سُوءُ الْعَذَابِ﴿٤٥﴾النَّارُ يُعْرَضُونَ عَلَيْهَا غُدُوّاً وَعَشِيّاً وَيَوْمَ تَقُومُ السَّاعَةُ أَدْخِلُوا آلَ فِرْعَوْنَ أَشَدَّ الْعَذَابِ ﴿٤٦﴾)) (غافر: ٤٥-٤٦).

ئانكو: خرابترین جزادان گەهشتە دەستەكا فیرعەونی، وەكی ئەو سپێدە و ئێڤاران ب ئاگری هاتینە ئیزادان، و دەمێ رۆژا رابوونێ دئێت خودایێ مەزن فەرمانێ ددەت كو فیرعەون و دەستەكا وی بچنە د دژوارترین رەنگێن ئیزاییێدا.

## پەیاما ئایەتان:

١- مرۆڤی، ل بەر مرنێ ژی هشا مرۆڤی د سەریدایە، و ئەو دشێت د گەل خودایێ مەزن و فریشتەیان باخڤت، و بەرسڤا پسیارا وان بدەت.

٢- پشتی مرنێ مرۆڤ دچتە جیهانا بەرزەخێ، كو قۆناغەكە د كەڤتە ناڤبەرا مرنێ و رۆژا رابوونێدا.

٣- پشتی مرنێ مرۆڤ د قۆناغەكێدایە دشێت د گەل فریشتەیان باخڤت.

٤- چالاكییا مرۆڤی یا لەشی ب رۆحێڤە یا گرێداییە، و دەمی روحا وی ژ بەرێ فریشتەیانڤە دئێتە ستاندن، چو هێز د لەشێ وی نامینت و چالاكییێن وی ژی ب دووماهییێ دئێن، بەلێ چالاكییێن روحێ بەردەوام دمینن.

٥- قۆناغا خەلاتكرنا باوەرداران و جزادانا كافران ل بەرزەخێ دەست پێ دكەت.

٦- جیهانا بەرزەخێ وەكی ڤێ جیهانێ تخووبدایی نینە، و د شیانا مرۆڤیدایە ئەو هەست ب هندەك تشتان بكەت كو پێشتر هەست پێ نەكربت.

## پسیار:

١- دنیا و بەرزەخ د چ تشتیدا وەكی ئێكن؟ و بەرزەخ و رۆژا دووماهییێ د چ تشتیدا وەكی ئێكن.

٢- ئەو چ تشتە د گەل مرۆڤی دچتە جیهانا بەرزەخێ، و ژێڤە نابت؟

# کارنامەیا مرۆڤی ل بەرزەخێ

مرۆڤ ژ دنیایێ بار دکەت، بەلێ شوونوارێن وی دمینن و ناچن، و کاری ل ژیانا مرۆڤان پشتی وی دکەن، و پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) د ڤێ چەندێدا دبێژت: ((من سن في الإسلام سنة حسنة فله أجرها وأجر من عمل بها إلى يوم القيامة، ومن سن سنة سيئة فعليه وزرها ووزر من عمل بها إلى يوم القيامة)) ئانکو: هەچییێ ڕێکەکا باش بدانت خێرا وێ و خێرا هەر کەسێ کار پێ بکەت بۆ وییە، و هەچییێ ڕێکەکا خراب بدانت گونەها وێ و گونەها هەر کەسێ کار پێ بکەت ل سەر وییە.

و ئەڤە باوەرداری پال ددەت کو ئەو د گۆتن و کریارێن خوەدا یێ هشیار بت، و کاری بکەت کو ببتە جهێ چاڤلێکرنێ و نیشانا باشییێ و ڤیانا مرۆڤان، و ببنە خودان ڕەوشتەکێ بلند، و کاری بۆ هندێ بکەت خەلکی وەکی خوە لێ بکەت.

قورئانا پیرۆز د چەند ئایەتاندا ئاگەهدارییا مە دکەت کو مرۆڤ نە ب تنێ ژ وان کاران یێ بەرپسیارە ئەوێن ئەو ئێکسەر پێ ڕادبت، بەلکو ئەو یێ بەرپسیارە ژ شوونوارێ وان کاران ژی یێ ئەو ل پاش خوە دهێلت، و ئەڤە وێ ڕامانێ دگەهینت کو باوەردار دڤێت کاری بکەت کو چاکییێن وی هەردەم گەش بن، دا خەلك بەحسێ وی ب باشی بکەت، و دا ئەو شوونوارێن ئەو ب پاش خوەڤە دهێلت بۆ وی ببنە ژێدەرێ سەرفرازییێ ل دنیایێ و ئاخرەتێ. خودایێ مەزن دبێژت: ((إِنَّا نَحْنُ نُحْيِي الْمَوْتَى وَنَكْتُبُ مَا قَدَّمُوا وَآثَارَهُمْ وَكُلَّ شَيْءٍ أَحْصَيْنَاهُ فِي إِمَامٍ مُبِينٍ)) (يس: ١٢) ئانکو: ئەم مرییان زێندی دکەین، و ئەم شوونوارێن وان ب پاش خوەڤە هێلاین دنڤیسین، و ئەو ل نك مە د تۆمارەکێدا دنڤیسینە.

هەر وەسا خودایێ مەزن دبێژت: ((يُنَبَّأُ الْإِنسَانُ يَوْمَئِذٍ بِمَا قَدَّمَ وَأَخَّرَ)) (القيامة: ١٣) ئانکو: ڕۆژا دووماهییێ دێ بۆ مری ئێتە گۆتن کانێ وی چ کرییە و چ ل پاش خوە هێلایە.

### دان و ستاندن:

ئەو چ كارن بەرى مرۆڤى دچن، و چ كارن ژ شوونوارێن وى دئێنە هەژمارتن؟

### پێشنیار:

بەحسێ هندەك مرۆڤێن باش - ل گوندێ خوە، یان ل باژێرێ خوە - بكە، كو شوونوارێن باشییێن وان پشتی وان مابن و خەلك هێشتا ب باشی بەحسێ وان دكەن.

## ئەنجام و بەرهەمێ كاری

د وانەیا بۆریدا مە بەحسێ ڕۆژا ڕابوونێ و وان ڕوودانان كر یێن تێدا چێ دبن، و كانێ چاوا خودێ ب دادگەهكرنا مرۆڤان ڕادبت، دەمێ شاهد دئێنە بەرهەڤكرن و تۆمارێن مرۆڤان بۆ وان دئێنە دان.

و د ڤێ وانەییێدا، و وەكی ژ ئایەتێن قورئانێ دئێتە وەرگرتن، دێ بەرێ خوە دەینە ئەنجام و بەرهەمێ كارێن مرۆڤی هەتا ئەو دگەهتە مالا خوە یا دووماهییێ، دا وێ پەیوەندییێ بزانین ئەوا د ناڤبەرا كارێ مە یێ دنیایێ و وی جزاییدا هەی ئەوێ ل ڕۆژا دووماهییێ بۆ مە دئێتە دان. خودایێ مەزن دبێژت: ((وَسِيقَ الَّذِينَ كَفَرُوا إِلَى جَهَنَّمَ زُمَراً حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا فُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا أَلَمْ يَأْتِكُمْ رُسُلٌ مِّنكُمْ يَتْلُونَ عَلَيْكُمْ آيَاتِ رَبِّكُمْ وَيُنذِرُونَكُمْ لِقَاء يَوْمِكُمْ هَذَا قَالُوا بَلَى وَلَكِنْ حَقَّتْ كَلِمَةُ الْعَذَابِ عَلَى الْكَافِرِينَ ﴿٧١﴾ قِيلَ ادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ ﴿٧٢﴾ وَسِيقَ الَّذِينَ اتَّقَوْا رَبَّهُمْ إِلَى الْجَنَّةِ زُمَراً حَتَّى إِذَا جَاؤُوهَا وَفُتِحَتْ أَبْوَابُهَا وَقَالَ لَهُمْ خَزَنَتُهَا سَلَامٌ عَلَيْكُمْ طِبْتُمْ فَادْخُلُوهَا خَالِدِينَ﴿٧٣﴾ وَقَالُوا الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُ وَأَوْرَثَنَا الْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ الْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَاء فَنِعْمَ أَجْرُ الْعَامِلِينَ ﴿٧٤﴾)) (الزمر: ٧١-٧٤). ئانكو: ئەوێن كوفری ب خودێ و پێغەمبەری كرین، كۆمكۆمە بۆ دۆژەهێ هاتنە هاژۆتن، و دەمێ ئەو دگەهن دەرگەهێن دۆژەهێ بۆ دئێنە ڤەكرن، فریشتەیێن دەرگەهڤان دبێژنە وان: ئەرێ ما هندەك پێغەمبەر ژ هەوە ب خوە، بۆ هەوە نەهاتبوونە هنارتن ئایەتێن خودایێ هەوە بۆ هەوە بخوونن، و هەوە ژ سەهما ڤێ ڕۆژێ بترسینن؟ ئەو دبێژن: بەلێ، بەس پەیڤا خودێ ب جه هات كو ئیزایا وی دێ ب سەر كافراندا ئێت. ڤێجا بۆ كافران هاتە گۆتن: هوون د دەرگەهێن دۆژەهێڕا ب ژۆركەڤن و هەر و هەر تێدا بمینن، ڤێجا پیسە دووماهییە ئەو دگەهنێ. و ئەوێن تەقوایا خودایێ خوە كرین و گوهدارییا وی كرین، كۆمكۆمە بۆ بەهەشتێ هاتنە هاژۆتن، هەتا دەمێ ئەو دگەهنێ دێ بینن دەرگەهێن وێ ڤەكرینە، ڤێجا فریشتە ب خێرهاتنا وان دكەن، و ب كەیف و گرنژینڤە پێشوازییێ ل وان دكەن، و دبێژنێ: سلامەتییا ژ هەمی نەخوەشییان بۆ هەوە بت، هوون دخوەش بن، ڤێجا هوون وەرنە د بەهەشتێدا و هەر و هەر تێدا بن. و ئەو دبێژن: سوپاس بۆ وی خودایی ئەوێ سۆزا خوە د گەل مە ب جه ئینایی، و ئەم ل ئەردێ بەهەشتێ كرینە میراتگر چ جهێ مە بڤێت ئەم لێ ددانین،

ڤێجا چ باشه خێره بۆ وان دئێته دان ئەوێن د گوهدارییا خودایێ خوەدا قەنجی کرین.
خودایێ مەزن دبێژت: ((وَنَضَعُ الْمَوَازِينَ الْقِسْطَ لِيَوْمِ الْقِيَامَةِ فَلَا تُظْلَمُ نَفْسٌ شَيْئاً وَإِن كَانَ مِثْقَالَ حَبَّةٍ مِّنْ خَرْدَلٍ أَتَيْنَا بِهَا وَكَفَى بِنَا حَاسِبِينَ)) (الأنبياء: ٤٧) ئانکو: ڕۆژا ڕابوونێ ئەم تەرازوویا دادییێ ددانین، و کەسێ هندی دنکەکێ زۆرداری لێ نائێتەکرن، و ئەم بەسین کریارێن وان بهەژمێرین.
خودێیە ڕۆژا ڕابوونێ کارێ مرۆڤان هلسەنگینت، و ئەوە دادوەرێ دلۆڤان و گونەهژێبر، و ل دادگەها خودایی مرۆڤ ب تنێ د گەل کارێ خوە ئامادە دبت.
خودایێ مەزن دبێژت: ((وَالْوَزْنُ يَوْمَئِذٍ الْحَقُّ فَمَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ فَأُوْلَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)) (الأعراف: ٨) ئانکو: کێشان ڕۆژا ڕابوونێ هەقە.
و تەرازوویا کاران هەقی و دادییە، خودایێ مەزن دبێژت: ((فَأَمَّا مَن ثَقُلَتْ مَوَازِينُهُ ﴿٦﴾ فَهُوَ فِي عِيشَةٍ رَّاضِيَةٍ ﴿٧﴾ وَأَمَّا مَنْ خَفَّتْ مَوَازِينُهُ ﴿٨﴾ فَأُمُّهُ هَاوِيَةٌ ﴿٩﴾)) (القارعة: ٦-٩) ئانکو: هەچییێ تەرازوویا کارێن وی یێن چاك یا گران بت، ئەو دێ د ژینەکا خوەشدا بت کو ئەو پێ ڕازی ببت، و هەچییێ تەرازوویا کارێن وی یێن چاك یا سڤك بت، دووماهییا وی دۆژەهە.

## ١- جهێ گونەهکاران:

پشتی دادگەهکرن ب دووماهی دئێت، دۆژەهی کۆمکۆمە بۆ دۆژەهێ دئێنە هاژۆتن، و ل وێرێ ئەو پەشێمان دبن، و ل سەر ژینا خوە یا وان ب ڤی ڕەنگی بۆراندی ئەو کۆڤاندار دبن، ڤێجا ئەو دوعایێ ژ خودێ دکەن کو ئەو وان بزڤرینه دنیایێ، دا ب ڕەنگەکێ وەسا بژین کو بچنە بەهەشتێ، بەلێ دەلیڤە ژ دەست وان دەرکەڤت، و ئەو هیڤی دکەن ئێزا ل سەر وان بێتە سڤککرن بەلێ چو مفا د هیڤییا واندا نینە.

ئەو باوەردارێ ڤێ دووماهییێ دبینت خوە ژێ بێ ئاگەه ناکەت، لەو فەرە ل سەر گەنجان کار بکەن و گەنجینییا خوە ژ قەستا نەبۆرینن ب وان تشتانڤە ئەوێن نە ل دنیایێ و نە ل ئاخرەتێ مفایی نەگەهیننە وان، و دڤێت ئەو خوە ژ کارێن خراب بدەنە پاش وەکی: ڤەخوارنا مەیێ، و ماددەیێن بێهۆشکەر، و کرنا قومارێ، و زنایێ، و درەوێ، و دوڕوویاتییێ، و خاپاندنێ، و گەهاندنا نەخوەشییێ بۆ هەڤال و هۆگران و هەمی مرۆڤان، و دڤێت ئەو ڕێ نەدەنە کەسێ کو وان ب کار بینن بۆ کرنا خرابی و ترساندنا مرۆڤان، چونکی خودایێ مەزن عەقلێ داییە مە، و ئەم بەرانبەر خوە و مال و جڤاکا خوە بەرپسیارین ژ وی کارێ ئەم دکەین.

### ٢- جهێ قەنجیکاران:

مرۆڤێن قەنجیکار بۆ بەهەشتێ دئێنە برن، و ئەو پێشوازییێ ل وان دکەت دەمێ دگەهن، و دەرگەهێن خوە بۆ وان ڤەدکەت، و مزگینی بۆ وان دئێتەدان کو سەرا باشییێن وان ل دنیایێ کرین ئەو هەروهەر دێ میننە د خوەشییێن بەهەشتێدا، و نامرن، و دلخوەش دێ ژین، و هەر تشتەکێ دلێ وان دخوازت بۆ وان هەیە، و چو خەم و کۆڤان و نەخوەشی د بەهەشتێدا نینە.

### دان و ستاندن د گەل خوە:

جارەکا دی هزرا خوە د خوەدا بکە، و ب لەز شیانێن خوە یێن ناڤخوەیی ببینە، دا لەزێ د کرنا چاکییێدا ل ڤێ دنیایێ بکەی، کو پێ بچییە بەهەشتێ، نەخشەیەکی بۆ خوە بدانە دا پتر مفایی ژ شیانێن خوە ببینی، دا ببییە مرۆڤەکێ خێرخواز و قەنج.

دان و ستاندن:

١- بۆچ شاهد ل ڕۆژا ڕابوونێ بەرهەڤ دبن؟

٢- بۆچ ڕۆژا ڕابوونێ زۆرداری ل مرۆڤی نائێتەکرن؟

### ڤەکۆلان:

ئەم چ ژ ڤان ئایەتان تێ دگەهین؟ و کارلێکرنا وان ل سەر باوەرداری چیە؟

# پێناسەیا ئیسلامێ

## أ- پەیدابوونا ئیسلامێ و هنارتنا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن):

سەرهاتییا پەیدابوونا ئیسلامێ ب هنارتنا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) دەست پێ دکەت، دەمێ خودایێ مەزن ئەو قورئان بۆ وی هنارتی، ئەوا رێباز و رێبەر دئێتە هەژمارتن بۆ ژینا موسلمانان، و مرۆڤینییێ هەمییێ ل هەمی دەم و هەمی جهان، وەکی خودایێ مەزن دبێژت: ((الَر كِتَابٌ أَنزَلْنَاهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ النَّاسَ مِنَ الظُّلُمَاتِ إِلَى النُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَى صِرَاطِ الْعَزِيزِ الْحَمِيدِ)) (إبراهيم: ١). ئانکو: سووند ب ڤان هەر سێ پیتان (أ، ل، ر) ئەو پەیاما بۆ تە هاتییە هنارتن بۆ رزگارییا مرۆڤانە ژ تارییان بۆ رۆناهییێ ب ئانەهییا خودێ، دا تو بەرێ وان بدەیە رێکا وی خودایی ئەوێ سوپاسییا وی دئێتە کرن.

و خودایێ مەزن سۆز داییە ئەو ڤێ پەیامێ هەتا رۆژا دووماهییێ بپارێزت، و کەس نەشێت وێ تێك بدەت، وەکی خودایێ مەزن گۆتی: ((إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا الذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُ لَحَافِظُونَ)) (الحجر: ٩) ئانکو: ئەمین مە قورئان ئینايييە خوارێ، و ئەمین پارێزڤانێن وێ، و د گەل قورئانێ فەرمۆدەیێن پێغەمبەری ژێ (سلاڤ لێ بن) هەنە، ئەم شەریعەتێ ئیسلامێ ژێ وەردگرین.

و ئیسلام د گەل کو ئایینە، ئەو پەیامەکا شارستانی و چاکسازییە ژی، و ژێدەرێ زانستێیە.

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) ژ نك خودایێ مەزن هاتییە هنارتن، و ئەو چاکسازەکێ جیهانییە، و خودان پەیامەکا ئەسمانی یا مەزنە، و ل دەستپێکا هنارتنا وی، مرۆڤێن نەزان و زۆردار بەرهنگارییا وی کر، چونکی وان نەدڤیا پەرستنا بوتان بهێلن، و ژ ئالییەکێ دیڤە زۆردار ژ دادییا ئیسلامێ دترسان، چونکی ئیسلام بەرێ مرۆڤان ددەتە ئێکتاپەرێسییێ، و مرۆڤی ب روح و لەشڤە ب خودایێ ویڤە گرێددەت بێی کو وی هەوجەیی ب دەستکاتییا کەسەکێ دی هەبت. بەلێ ئایینێن دی وەسا ب پێدڤی ددیت کو بوتەك یان کەسەك د ناڤبەرا مرۆڤی و خودێدا هەبت دا مرۆڤ بگەهتێ، و چونکی ئیسلام داخوازا ئازدکرنا مرۆڤی و یەکسانییا د ناڤبەرا واندا دکەت، زۆردار و دەرەبەگ و خودانێن بەرژەوەندییان نەیارەتییا وێ دکر، هەتا مەسەلە گەهشتییە شەڕ و جەنگان،

و ژ بەر کو پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) و پەیاما وی بەرڤانی ژ هەژار و ستەملێکرییان دکر، ئەو نەچار بوو جهێ ژ هەمییان شرینتر ل بەر وی - کو مەکەهە - بهێلت، و پشتی هەشت ڕۆژان ژ چوونا ل بیابانێ ئەو ل (١٦ رەبیع ئەلئەووەلێ) بەرانبەر (٦٢٢/١١/٢٠ ز) گەهشتە باژێڕێ مەدینەیێ، و ئەڤ دەرکەڤتنە ب ناڤێ (مشەختبوونێ) دئێتە ناسین، ئەوا دئێتە هەژمارتن ڕوودانەکا دیرۆکی یا گرنگ د دیرۆکا ئیسلامێدا، چونکی ئەو دئێتە هەژمارتن دەستپێك بۆ بنەجهکرنا ستوونێن ئیسلامێ، و ل سەر دەمێ عومەرێ کوڕێ خەتابی (خودێ ژێ ڕازی بت) ئەو بوو دەستپێك بۆ سالنامەیا مشەختی یا موسلمانان.

## ب- پێناسەیا ئیسلامێ:

ئیسلام ئەوە مرۆڤ خوە ب دەست خودێڤە بەردەت و وی ب تنێ بپەرێست، و فەرمانێن وی ب جه بینت، و کەسێ بۆ وی نەکەتە هەڤپشك د پەرستنێدا، و ئیسلام ئەو دینە یێ خودێ بۆ مرۆڤینییێ هنارتی، و ئەو ئایینەکێ دی ژ بلی ئیسلامێ قەبوول ناکەت، وەکی د ئایەتەکێدا هاتی: ((إِنَّ الدِّينَ عِندَ اللّهِ الإِسْلاَمُ)) (آل عمران: ١٩) ئانکو: ل نك خودێ ب تنێ ئیسلام ئایینە.

و ب ڤێ چەندێ ئایینێن ئەسمانی یێن بەرێ هەمی ئیسلام بوون، هەر ژ دەمێ نووحی و پێغەمبەرێن پشتی وی ئیبراهیم و ئیسماعیل و یووسف و مووسا و عیسایی، و هەمی پێغەمبەرێن دی (سلاڤ لێ بن)، ئەو ئایینێن ئەو پێ هاتین ئیسلام بوو، و وان بەرێ خەلکی دابوو گوهدانا فەرمانێن خودێ و پەرستنا وی ب تنێ.

### ڕامانا تایبەت یا ئیسلامێ:

ئاستێ تێگەهشتنا مللەتان ل درێژییا دەمی دهاتە گوهاڕتن، و د گەل وەرارا مرۆڤینییێ ئاستێ زانستی ژی بلند دبوو، و مرۆڤی پێگاڤ بەر ب پێشکەڤتنێڤە دهاڤێتن، لەو ل هەر دەمەکی و بۆ هەر جهەکی خودێ پێغەمبەرەك دهنارت، و دەمەك بۆ وی دەستنیشان دکر، و چونکی وی دزانی دەمێ مە دێ بتە دەمێ زانست و تەکنەلۆژیایێ وی ئایینەکێ پێکهاتی ژ هەمی ڕەخانڤە بۆ مە هنارت، و موعجزەیا وی قورئان و زانستە، و ئێکەمین ئایەتا قورئانێ ب پەیڤا (اقرأ) دەست پێ دکەت.

ژ بەر ڤێ چەندێ داخواز ژدووکەڤتییێن ئایینێن بۆرین هاتەکرن کو ئەو ڕێکا ڤێ ئیسلاما نوو بگرن، چونکی ئەڤ ئایینێ نوو ژ هەمی ئالییانڤە یێ پێکهاتییە، و چو کێماسی تێدا نینن، و ئەو

نه یێ تایبەته ب جهەکی یان مللەتەکیڤە، بەلکو ئەو بۆ هەمی مللەتانه بێ جودایی، وەکی د گۆتنا خودێدا هاتی: ((وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِّلْعَالَمِينَ)) (الأنبياء: ١٠٧) ئانکو: ئەڤ پێغەمبەرە مە یێ هنارتی دا بۆ جیهانێ هەمییێ ببته دلۆڤانی، لەو ئەو ئایینێ پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) پێ هاتییه هنارتن بۆ مرۆڤان هەمییانه بێ جودایی، و ئەو کەسێ ژ کەسێ باشتر نابینت، رێکا باشتر دیتن و ب سەر ئێخستنا مللەتەکی ب سەر ئێکی دی نه ل دووڤ رەنگ و نەژادییه، بەلکو ل دووڤ تەقواداری و کارێ باشه.

**پسیار:**

بۆچ پەیڤا ئیسلام بۆ ئایینێن بەرێ دئێته گۆتن، ناڤێ وان یێ دی چ بت؟

**دان و ستاندن:**

ئەرێ پەیوەندییا ناڤێ (ئیسلام) ب ڤیانا (سەلامێ = ئاشتییێ)ڤە چیه؟

# گرنگترین تایبەتمەندییێن گشتی یێن ئیسلامێ

## ئێک: خودایی (الربانية):

ئانكو: ئایینێ ئیسلامێ ژ سەری هەتا دووماهییێ ب پێکهاتا پەیاما خوەڤە ژ نك خودایێ مەزنە، و خودایییا شەریعەتێ ئیسلامێ ژ دو لایان ڤە ئاشكەرا دبت:

### ١- خودایییا ژێدەرێ پەیامێ:

ڕێبازا ئیسلامێ و ئەو ئارمانجا هاتییە دانان بۆ گەهشتنا وێ ئارمانجێ، ژ بەرێ خودایێ پەروەردگارڤە ب ڕێکا وێ قورئانێ هاتییە دانان ئەوا وی بۆ پێغەمبەرێ خوە (سلاڤ لێ بن) هنارتی، ئەڤ پەیاما ژ نك خودێ هاتی بێی کو مللەتەکی یان ئوجاخەکێ یان کۆمەکا دەستنیشانکری یان پارتەکێ دەست تێدا هەبت، بەلکو ئەو ب حەزکرنا خودێ هاتییە داڕێتن، و ئارمانج ژێ، ڕۆنکرنا ڕێکێیە بەرانبەر مرۆڤی، و دلخوەشکرنا وییە، و ئەو ژ جوانی و دلۆڤانییا خودێ دەرکەڤتییە، وەکی د گۆتنا خودایێدا هاتی: ((يَا أَيُّهَا النَّاسُ قَدْ جَاءكُم بُرْهَانٌ مِّن رَّبِّكُمْ وَأَنزَلْنَا إِلَيْكُمْ نُوراً مُّبِيناً)) (النساء: ١٧٤) ئانكو: گەلی مرۆڤان نیشان و ڕۆناهییەکا ئاشكەرا ژ خودایێ هەوە بۆ هەوە هاتییە.

### ٢- خودایییا ئارمانجان:

ئارمانجا ئیسلامێ ژ گازییا خوە بۆ ژینەکا سەربلند د ڤێ دنیایێدا ئەوە مرۆڤ ب خودایێ خوەڤە بێتە گرێدان و ڕازیبوونا وی ب دەست خوەڤە بینت، و دڤێت ئارمانجا مرۆڤی یا سەرەکی د ژینا دنیایێدا ئەو بت ئەو خودێ ژ خوە ڕازی بکەت، وەکی خودایێ مەزن دبێژت: ((يَا أَيُّهَا الْإِنسَانُ إِنَّكَ كَادِحٌ إِلَى رَبِّكَ كَدْحاً فَمُلَاقِيهِ)) (الانشقاق: ٦) ئانكو: هەی مرۆڤ تو ب ڕێکا کەدا خوە، دێ ڕازیبوونا خودایێ خوە ب دەست خوەڤە ئینی و گەهییێ.

## دو: مرۆڤاینی:

مەرەم ب مرۆڤاینییێ ئەوە مرۆڤی بهایەکێ بلند و ڕێزگرتنەکا مەزن د ڤی ئایینیدا هەیە، و هەمی شەریعەت و یاسا بۆ دلخوەشییا مرۆڤی و دابینکرنا مافێن وی هاتینە دانان.
پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) وەکی مە مرۆڤ بوو، خودێ قورئان بۆ وی ئینابوو خوارێ و وی ئەو ب دەستپاکی گەهاندە مە، و مرۆڤ ئارمانجا سەرەکییە د پەیامێن هەمی پێغەمبەراندا، ئەو ئێکەمین جار وی بۆ پەرستنا خودێ ب تنێ داخواز دکەن، پاشی کاری بۆ هندێ دکەن کو دادییێ د ناڤبەرا مرۆڤاندا بنەجهـ بکەن، و بەرێ وان بدەنە برایینییێ، و وان ژ زۆرداریییێ ددەنە پاش، دا دلخوەش بژین.

## گرنگترین بناخەیێن ڕێزگرتنا مرۆڤان د ئیسلامێدا:

**١- جێگرییا ئەردی (الخلافة على الأرض):**

خودایێ مەزن ڕێز و بهایەکێ بەرچاڤ دا مرۆڤی دەمێ ئەو ب جێگری ل ئەردی دانایی، و ژێ خواستی ئەو ئەردی ئاڤا بکەت، و ژ بەر ڤێ چەندێ وی عەقل و زانین دایێ، و ئەو ب سەر فریشتەیان ئێخست.

**٢- ئافراندن ب جوانترین ڕەنگ:**

خودایێ مەزن مرۆڤ ب جوانترین ڕەنگی ئافراند، و وێنەیێ وی ژ یێ هەمی چێکرییان باشتر لێ کر، وەکی وی گۆتی: ((لَقَدْ خَلَقْنَا الْإِنسَانَ فِي أَحْسَنِ تَقْوِيمٍ)) (التين: ٤).

**٣- ڕوحا مرۆڤی د لەشیدا ژ خودێیە:**

وەکی خودایێ مەزن دبێژت: ((فَنَفَخْنَا فِيهِ مِن رُّوحِنَا)) (التحريم: ١٢) و مرۆڤ ب ڤێ چەندێ ب بها کەڤت، و ئەو دشێت ب ساناهی پەیوەندییێ د گەل خودێ بکەت، ئەگەر ئەو ڕوحا خوە ب گونەهان قڕێژی نەکەت.

**٤- بندەستکرنا چێکرییان بۆ مرۆڤی (تسخير المخلوقات):**

خودایێ مەزن دبێژت: ((وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ جَمِيعاً مِّنْهُ إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ)) (الجاثية: ١٣) ئانکو: هەر تشتەکێ ل ئەسمانان و ئەردی وی بندەستی هەوە کرییە..

و ئەڤە ژی ژ قەدرگرتنا خودێیە بۆ مرۆڤی، دا ئەو ب دلخوەشی ل سەر ئەردی بژیت، و بشێت خودایێ خوە بپەرێست، و خودێ ئەسمان و ئەرد ژ بەر وی ئافراندن، ب تایبەتی ئەرد ئەوێ ب هەمی قەنجییان هاتییە خەملاندن دا مرۆڤ ب خوەشی ل سەر بژیت و وی ئاڤا بکەت.

**٥- پارازتنا کەرامەت و مال و نامووسا مرۆڤی:**

ئیسلام گرنگییێ ددەتە پارازتنا کەرامەتا مرۆڤی، و ئەو خوون و مال و نامووسا وی حەرام دکەت، نە ب تنێ ل دنیاییێ، بەلکو پشتی مرنا وی ژی ئەو بهایی ددەتێ، دەمێ پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((شکاندنا هەستییێ مری وەکی شکاندنا هەستییێ وییە دەمێ یێ زێندی)).

**٦- مرۆڤ هەمی وەکهەڤ و یەکسانن بەرانبەر شەریعەتێ:**

ب دیتنا شەریعەتێ ئیسلامێ مرۆڤ هەمی وەکی ئێکن، و چو جودایی د ناڤبەرا واندا نینن ژ بەر ڕەنگی یان نەتەوەیی، و جودایی ب تنێ ل سەر بناخەیێ تەقوایێ و کارێ چاکە، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((هوون هەمی ژ ئادەمینە، و ئادەم ژ ئاخێیە)). و دەمێ قانوونەکا ئیسلامی بۆ جزادانا گونەهکاران دئێتە دانان، چو جودایی د ناڤبەرا مرۆڤاندا نائێتەکرن، و کەس نەشێت ژ بەر ئایینێ خوە یان نەتەوەیێ خوە ژ جزادانێ قورتال ببت.

## سێ: گشتگری و جیهانیبوون:

**گشتگری و جیهانیبوونا ئیسلامێ ژ ڤان خالان ئاشکەرا دبت:**

١- ئەو پەیاما خودێ بۆ پێغەمبەرێ خوە (سلاڤ لێ بن) هنارتی بۆ گشت مرۆڤانە ل سەر ئەردی هەتا ڕۆژا ڕابوونێ، و ئەڤ پەیامە بۆ نەتەوەیەکێ ب تنێ نینە، بەلکو بۆ هەمی نەتەوە و مللەت و کیشوەرانە، و د ئیسلامێدا مللەتێ خودێ یێ هلبژارتی نینە، و خودایێ پەروەردگار ب چاڤێ یەکسانییێ بەرێ خوە ددەتە هەمی مللەتان، ئەو هەمی ژ ئێك هێڤێنینە، وەکی خودایێ مەزن دبێژت: ((وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا كَافَّةً لِّلنَّاسِ بَشِيراً وَنَذِيراً وَلَكِنَّ أَكْثَرَ النَّاسِ لَا يَعْلَمُونَ)) (سبأ: ٢٨) ئانکو: هەی موحەممەد، مە تو بۆ هەمی مرۆڤان هنارتی..

٢- شەریعەتێ ئیسلامێ هەمی ئالییێن ژینا مرۆڤی ڤەدگرت، د هەمی قۆناغاندا، و ئیسلامێ سیستەمەك بۆ ژیانا مرۆڤی هەمییێ دانایییە، هەر ژ دەمێ بوونا وی و پشتی مەزن دبت و هەتا پیراتییێ و مرنێ ژی، بەلکو بۆ پشتی مرنێ ژی دەمێ ئەو دچتە بەهەشتێ یان دۆژەهێ.

**پسیار:**

ژ بلی ڤان خالێن بۆری، ڕێزگرتنا ئیسلامێ بۆ مرۆڤی د چ دایە؟

**دان و ستاندن:**

خودایێ مەزن ڕێز ل مرۆڤی گرتییە چ مێر بت چ ژن، بەلێ ئەم دبینین گەلەك جاران ژن ب دیتنەكا نزم دئێتە دیتن، و زۆرداری لێ دئێتە كرن، و مافێن وێ دئێنە خوارن، و ئەڤە دژی ئیسلامێیە، ئەڤ هەڤدژییە د ناڤبەرا ئیسلامێ و واقعێ مرۆڤاندا دڤێت بێتە چارەكرن.

## چار: ناڤنجیاتی:

ئایینێ ئیسلامێ ئایینەکێ ناڤنجییە، ئانکو: ئەو دژی توندکارییێ و خەمسارییێیە، و ناڤنجیاتییێ گەلەك رامانێن خوە د ئیسلامێدا هەنە، وەکی:

١- ئیسلام د دەستنیشانکرنا ماف و ئەرکاندا شەریعەتەکێ دادوەرە:

د ڤی واریدا پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((**إنما أهلك الذين من قبلكم أنهم كانوا إذا سرق فيهم الشريف تركوه، وإذا سرق فيهم الضعيف أقاموا عليه الحد، وأيم الله لو أن فاطمة بنت محمد سرقت لقطعت يدها**)) ئانکو: ئەوێن بەری هەوە هاتنە تێبرن چونکی دەمێ مەزنەکی ژ وان دزی کربا، وان ئەو دهێلا، و دەمێ هەژارەکی دزی کربا، وان دەستێ وی دبڕی، و ئەز ب خودێ کەمە ئەگەر فاتمایا کچا موحەممەد دزییێ بکەت ئەز دێ دەستێ وێ برم.

٢- ئیسلام ئایینەکێ ڕاستە و چو خواری تێدا نینن:

ئیسلام ڕێکەکا دورستە، و یا دوورە ژ گومانێ، بەرێ مرۆڤی ددەتە ڕێکەکا گەش یا ل دنیایێ دلێ وی خوەش دکەت، و ل ڕۆژا دووماهییێ جهێ وی دکەتە بەهەشت.

٣- ئیسلام هەمی خێرە و کارێ چاك و ڕاستگۆییە:

خودایێ مەزن دبێژت: ((كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكَرِ..)) (آل عمران ١١٠) ئانکو: هوون باشترین مللەتن بۆ مرۆڤان هاتینەدان، چونکی هوون فەرمانا ب باشییێ ل مرۆڤان دکەن، و بەرێ وان ژ خرابییێ ددەنە پاش.

٤- ئیسلام ئایینەکێ ناڤنجییە د باوەری و پەرستنێدا، و بارا پتر ژ تشتان تێدا حەلالن، و تشتێن حەرام کێمن.

٥- ئیسلام ئایینێ ئاشتی و برایینی و پێکڤەژیانێیە د ناڤ ئایین و مللەتاندا.

## پێنج: واقعییەت:

ئیسلام دینەکە بۆ مرۆڤی هاتییە خوارێ، و ئەو هەمی کاودانێن مرۆڤی بەرچاڤ وەردگرت، و د گەل خوڕستییا وی دگونجت، و بۆ دلخوەشییا مرۆڤی هاتییە، و گرنگییێ ددەتە حەز و دلچوونێن وی و ڕێکێ ددەتێ کو ئەو وان ب ڕێکەکا حەلال تێر بکەت، و بەرانبەر ڤێ چەندێ ئەو ژێ دخوازت کو ئەو خوە ژ خرابی و کارێن حەرام بدەتە پاش دا زیانێ نەگەهینتە خوە و جڤاکا خوە.

## شەش: ساناهی و ئاشکەرایی:

تشتێ ئیسلامێ ژ ئایین و بۆچوونێن دی جودا دکەت ئەوە ئیسلام ئایینەکێ ساناهی و ئاشکەرایە، هەر کەسەك ئەگەر ئاستێ وی چەند ژی بت ب ساناهی تێ دگەهت، ئەو ئایینەکە بەحسێ ئێك خودایی دکەت، کو پێدڤییە مرۆڤ بپەرێست و داخوازا هاریکارییێ ژێ بکەت.

و ئەو هەمی تشتێن نەبەرچاڤ و غەیبی یێن ئیسلامێ بەحس ژێ کرین وەکی سالۆخەتێن خودێ و بەهەشتێ و دۆژەهێ، هندەك تشتن مرۆڤ ب ساناهی تێ دگەهت، چونکی ئەو ئاشکەرانە.

### پێشنیار:

هندەك نموونەیان ل سەر واقعییەتا ئیسلامێ بینە.

### پسیار:

ناڤنجیاتییا ئیسلامێ چ ڕادگەهینت؟

### دان و ستاندن:

ئیسلام ئایینەکێ جیهانییە و نە یێ مللەتەکێ ب تنێیە، ئەرێ پەیوەندییا ڤێ چەندێ ب وەکهەڤی و یەکسانییا د ناڤبەرا مرۆڤ و مللەتاندا چیە؟

# تێگەهێ پەرستنێ د ئیسلامێدا

پەرستن د ئیسلامێدا دەربڕینێ ژ هندێ دکەت مرۆڤ د هەمی کار و کریارێن خوەدا بەرێ خوە بدەتە خودێ، و ب دلێ خوە و حەژێکرنڤە خوە بێختە بن شەریعەتێ وی، بۆ هندێ کو خێر ب دەستڤە بێت و خودێ ژێ ڕازی ببت و بچتە بەهەشتێ، و خوە ژ جزادانێ بپارێزت و ژ دۆژەهێ قورتال (ڕزگار) ببت.

## ستوونێن ئیسلامێ:

ئیسلامێ هندەك ستوونێن گرنگ هەنە، ب ڕێکا وان ئیسلام ب جهـ دئێت، و مرۆڤ دشێت گوهدارییا خوە بۆ خودێ بەرچاڤ بکەت.

### ستوونا ئێکێ: شاهدەدان:

کو بێژت: (اشهد ان لا اله الا الله واشهد ان محمدا رسول الله) ئانکو: ئەز باوەر دکەم کو ژ بلی خودێ چو خوداییێن ڕاست نینن، و موحەممەد پێغەمبەرێ وییە.

گۆتنا (لا اله الا الله) ڕامانا وێ ئەوە تو باوەرییێ ب مەزنییا خودێ بینی، و ئەو ب تنێ هێژایی پەرستنێیە، و ئەوە یێ چێکری فەرمانا وی ب جهـ دئینن، و ئەوە ژین و مرن د دەستیدا. و گۆتنا (محمد رسول الله) ڕامانا وێ ئەوە تە باوەری هەبت کو موحەممەد (سلاڤ لێ بن) پێغەمبەرەکە ژ نك خودێ بۆ هەمی مرۆڤان هاتییە هنارتن، و ئەو مزگینییێ ددەتە دووکەڤتییێن خوە، و گەفێ ل وان دکەت یێن گوهدارییا وی نەکەن، و پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) دڤێت مرۆڤینییێ ژ زۆرداری و تارییێ دەربێخت و بەر ب ڕزگاری و بلندی و ڕازیبوونا خودێڤە ببەت.

قورئانا پیرۆز ژ لایێ خودایێ مەزنڤە هاتییە خوارێ، و ئەو دووماهی کتێبە ژ نك وی هاتی، و ئەو ڕێبازەکا پێکهاتییە بۆ بەختەوەرییا ژینا مرۆڤان هاتییە، و بەرێ مرۆڤان ددەتە کارێ چاك و ڕەوشتێ باش، دا کو ب دلڕەحەتی بژین، و ل سەر موسلمانی ئەوە باوەرییێ بینت کو موحەممەد (سلاڤ لێ بن) دووماهی پێغەمبەرە یێ کو دڤێت مرۆڤ چاڤ لێ بکەن و ل سەر ڕێکا وی بچن.

## ستوونا دويێ: نڤێژ:

نڤێژ پەیوەندییەکە د ناڤبەرا مرۆڤی و خودایێ ویدا، ڕۆژێ پێنج جاران ئەو دئێتەکرن، و هەر نڤێژەکێ ڕکاعەت و دەمێ خوە یێ دەستنیشانکری هەیە، و مرۆڤ بەرانبەر ڕووگەهێ (قیبلەیێ) ڕادوەستت بۆ کرنا نڤێژێ.

و ژ مفایێن د نڤێژێدا هەین، ئەوە مرۆڤێ لاواز و هەژار ب خودایەکێ ب هێز و خودان شیان و دەولەمەندڤە دئێتە گرێدان، و نڤێژ ل هندەك دەمێن دەستنیشانکری وی ژ مژوولییێن ژیانێ قورتال (ڕزگار) دکەت و خودێ ل بیرا وی دئینتەڤە، دەمێ ئەو بەرێ خوە ددەنە خودایێ خوە یێ گونەهژێبر و دلۆڤان دا گونەهێن وی ژێ ببەت، و هاریکارییا وی بۆ سەرکەڤتنێ د ژیانێدا بکەت: ((الْحَمْدُ للّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ﴿٢﴾ الرَّحْمنِ الرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَالِكِ يَوْمِ الدِّينِ﴿٤﴾ إِيَّاكَ نَعْبُدُ وإِيَّاكَ نَسْتَعِينُ ﴿٥﴾)) (الفاتحة: ٢-٥).

نڤێژ پەیوەندییەکە د گەل خودایێ مەزن و ب هێز و ڕاستگۆ، هێزێ ددەتە دلی و ڕەحەتییێ ددەتە نەفسێ، و پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) هەر جارەکا نەخوەشییەك ب سەردا هاتبا دگۆتە بیلال: مە ب نڤێژێ ڕەحەت بکە.. خودایێ مەزن دبێژت: ((وَأَقِيمُواْ الصَّلاَةَ وَآتُواْ الزَّكَاةَ وَارْكَعُواْ مَعَ الرَّاكِعِينَ)) (البقرة: ٤٣) ئانکو: هوون نڤێژێ بکەن و زەکاتێ بدەن، و د گەل نڤێژکەران نڤێژێ بکەن. و پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د گۆتنەکا خوەدا دبێژت: ((ژ ڤێ دنیایا هەوە، بێنێن خوەش و ژن ل بەر من هاتنە شرینکرن، لێ ڕۆناهییا چاڤێن من، نڤێژە)).

و کرنا نڤێژێ ب دورستی نەفسا خودانێ خوە ڕەحەت دکەت، هەتا هەست ب هاریکارییا خودێ بکەت، و ژیانێ ب ڕەنگێ وێ یێ جوان ببینت، و هەست ب سەرکەڤتنێ د کارێن خوە دا بکەت، و ژ ئاستەنگێن ژینێ دەرباز ببت.

## ستوونا سێیێ: زەکات:

و ئەو دەرئێخستنا پشکەکا مالییە سالانە، و ل دووڤ شەریعەتی ئەو ژ ڕێژەیا (٥ر٢ ٪) دەست پێ دکەت و ژ (١٠ ٪) نابۆرت، و مالێ زەکاتێ بۆ هندەك کەسێن دەستنیشانکری دئێتە دان، وەکی کەسێن هەژار و بەردەستێ وان تەنگ، یان ژی بۆ ب جهئینانا هندەك پرۆژەیێن گشتی دئێتە دان وەکی: پارازتنا وەلاتی ژ نەیاران، یان چاکسازی و خزمەتێن گشتی یێن مفایێ وەلاتییان تێدا، و ئەڤە دبتە ئەگەرا پەیداکرنا بەرژەوەندییەکا مەزن ل سەر ئاستێ تاکەکەس و جڤاکێ، وەکی پەیداکرنا

ڕەنگەکێ چاڤدێرییا جڤاکی، و بەلاڤکرنا گیانێ ڤیان و هاریکارییێ د ناڤبەرا کوڕێن جڤاکێدا، و نەهێلانا دیاردەیێن کرێت د ناڤ جڤاکێدا، وەکی دلڕەشی و قەلسییێ..

## ستوونا چارێ: ڕۆژی:

ئەو ژی ڕەنگەکێ پەرستنێیە، و مەرەم پێ ئەوە مرۆڤ ژ بانگێ سپێدێ هەتا ڕۆژئاڤاییێ خوە ژ هندەك تشتێن حەلال بدەتە پاش، وەکی: خوارن و ڤەخوارنێ، ل هەیڤا رەمەزانێ. خودایێ مەزن دبێژت: ((یَا أَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُواْ کُتِبَ عَلَیْکُمُ الصِّیَامُ کَمَا کُتِبَ عَلَى الَّذِینَ مِن قَبْلِکُمْ لَعَلَّکُمْ تَتَّقُونَ)) (البقرة: ١٨٣).

## مفایێن ڕۆژییێ:

١- ئەو مرۆڤی فێری بێنفرەهییێ دکەت ل سەر برس و تێنیبوونێ.
٢- گەلەك مفایێن ساخلەمییێ ژی تێدا هەنە، وەکی: قورتالبوون ژ ژەهرداربوونێ، سلامەتییا ئەندامێن لەشی وەکی گەهـ و دەماران، و هتد..
٣- پاقژکرنا دلی و ئاڤاکرنا وی ب باوەرییێ و ترس و ڤیانا خودێ.
٤- پاقژکرنا مرۆڤی ژ گونەهان، ڤێجا ئەو هەست ب خوەشی و ڕەحەتییا دلی دکەت.

## ستوونا پێنجێ: حەج:

ئانکو: چوونا مالا خودێ ل مەکەهێ بۆ جهئینانا ڤێ ستوونێ، ل دەمەکێ دەستنیشانکری ل سالێ، و ئەو جارەکا ب تنێ د ژییێ مرۆڤیدا فەرە، و ئەو ڕێبازا پێغەمبەرێ خودێ ئیبراهیمیە (سلاڤ لێ بن) موسلمان هەر سال نوو دکەنەڤە.

حەج گۆنگرەیەکێ سالانەیە، موسلمان ژ هەمی لایێن دنیایێ و ژ هەمی ڕەنگ و مللەتان لێ کۆم دبن، بیر و بۆچوونان ل دۆر گرفتارییێن جیهانێ بێن مەزن پێك دگوهۆڕن، و ب ڤێ چەندێ پەیوەندی د ناڤبەرا مللەتێن موسلماناندا پەیدا دبن، و ڤیان و هاریکاری زێدە دبت، و ئەو مفایی ژ شیرەتێن ئێکدو دبینن، و ئاگەهداری سەروبەرێ موسلمانان دبن ل جیهانێ.

**پسیار:**

بۆچ دبێژنە ڤان ستوونان (ستوونێن ئیسلامێ)؟

# تێگەهێ موسلمانکرنێ

موسلمان ئەوە یێ باوەری هەبت کو خودایەکێ ب تنێ هەیە، و موحەممەد (سلاڤ لێ بن) پێغەمبەرێ وییە، و ب ڤێ چەندێ ئەم دشێین پەیوەندییا موسلمانان ب ئیسلامێڤە ل سەر دو پشکان لێکڤە بکەین:

## ئێک: ئیسلاما سەرڤە سەرڤە:

ئانکو: ئیسلاما بەرچاڤ، یا وەسا کو باوەری نەچوویتە د کووراتییا دلیدا، و کارەکێ بەرچاڤ ل ژین و ڕەفتار و هەڤبەندییێن (پەیوەندییێن) مرۆڤی یێن جڤاکی نەکربت، چونکی موسلمانەتییا وی تشتەکێ ب سەرڤەیە، و وی ئیسلام وەك چاڤلێکرنەکا کۆرە ژ پێشییێن خوە وەرگرتییە، و ئەڤ ڕەنگێ موسلمانان نەشێن مفایی بۆ خوە ژ بیر و باوەر و بهایێن ئیسلامێ وەرگرن، و ئەو ژ کاکلکا ئیسلامێ زڕبارن، و ژ ئالییێ دەروونیڤە ئەو چو خوەشییێ ژ پەرستنا خودێ نابینن، و ب ساناهی ئەو بەر ب کرنا گونەهانڤە دچن، و ڤیانا خودێ د دلێن واندا لاوازە، و ئەو گرنگییێ نادەنە ڕۆژا دووماهییێ.

## دو: ئیسلاما ب باوەری:

ئەو موسلمانێ باوەرییا خوە ل سەر بناخەیەکێ موکم و تێگەهشتنەکا دورست ئاڤا کربت، و ژیانا خوە ل دووڤ شەریعەتێ خودێ ب ڕێڤە ببەت، ئەوە باوەردارێ دورست، و ئەڤ تێگەهشتنەیە دبێژنێ: باوەری، و ئەو موسلمانێ ب ڤی ڕەنگێ ب هێز پەیوەندی د گەل خودایێ خوە هەبت، و شەریعەتێ وی ب کار بینت، ئەوە دبێژنێ: باوەردار.

و ب ڤێ چەندێ بۆ مە ئاشکەرا دبت کو باوەر پێکەکا بلندترە ژ ئیسلامێ، چونکی ئەو باوەرییەکا ڕاستگۆ و هشیارە ب ئیسلامێ، و ب ڕێکا ڕەوشت و پەیوەندییێن جڤاکی و پەرستنێ وێ کارڤەدانەیا خوە ل سەر ژیانا ڕۆژانە یا مرۆڤی هەیە.

قورئانا پیرۆز ڤان هەردو پێکان ب ڕەنگەکێ باش بۆ مە ئاشکەرا دکەت، دەمێ ئاشکەرا دکەت کو خودایێ مەزن ژ موسلمانی دخوازت ئەو ل پێکا دویێ بت، ئانکو: ببتە باوەردارەکێ پێگیر ب فەرمانێن خودێڤە، و نە موسلمانەکێ سەرڤەسەرڤە بت، و بێئاگەهـ بت ژ قانوون و بناخەیێن شەریعەتی، و ب دیتنا قورئانێ موسلمانێ دورست ئازادە د هلبژارتنا ئایینی و گوهدارییا خودایێ خوەدا، و ئەو ب دلێ خوە ڤێ چەندێ دکەت، خودایێ مەزن بەحسێ موسلمانەتییا پێغەمبەرێ خوە ئیبراهیمی (سلاڤ لێ بن) دکەت، و دبێژت: ((**إِذْ قَالَ لَهُ رَبُّهُ أَسْلِمْ قَالَ أَسْلَمْتُ لِرَبِّ الْعَالَمِينَ**)) البقرة: ١٣١) ئانکو: دەمێ خودایێ وی گۆتییێ: موسلمان ببە، وی گۆت: ئەز بۆ خودایێ هەمی چێکرییان موسلمان بووم.

هۆسا قورئان بەحسێ موسلمانێ دورست دکەت، و باوەرییا تەمام و بێ دەغەل بۆ وی دخوازت، ئەو باوەرییا ل سەر بناخەیێ تێگەهشتن و هشیارییێ ئاڤاکری، و ڕەفتار و کارێ وی یێ ڕۆژانە ڕەنگڤەدانا باوەرییا وی بت.

ئیسلام ئایینەکە بەختەوەرییا دنیایێ و ئاخرەتێ بۆ مرۆڤی دڤێت، چونکی ئەو پەیامەکە بۆ بەختەوەرییا مرۆڤی هاتییە، و دا بەرێ وی بدەتە ڕێکا چاکییێ، و وی ژ ڕێکا خراب و سەرداچوونێ دوور بێخت، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((**إنما بعثت لأتمم مكارم الأخلاق**)) ئانکو: ئەزێ هاتیمە هنارتن، دا سنج و ڕەوشتێن باش تەکووز (تەمام) بکەم.

## جهـ و سالۆخەتێن گەنجێ موسلمان

قۆناغا گەنجینییێ قۆناغەکا گرنگە د ژینا مرۆڤیدا، و ب دیتنا ئیسلامێ ژی وێ گرنگییەکا تایبەت هەیە، لەو ب ڕەنگەکێ تایبەت ل ڤێرێ ئەم دێ ئاماژەیێ پێ دەین:

١- دڤێت گەنجێ موسلمان دلەکێ پاقژ هەبت، و خودانێ ڕەوشتەکێ پاك و بلند بت، و بۆ سنج و ڕەوشتان ژی، پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بۆ خوە بکەتە جهێ چاڤلێکرنێ.

٢- دڤێت گەنجێ موسلمان باوەرییەکا موکم هەبت، و ڤیانا خودێ د کووراتییا دلێ ویدا بت، و ب دلپاکی خودێ بپەرێست، و فەرمانێن وی ل ئەردی نەدەت.

٣- دڤێت گەنجێ موسلمان ئیسلامێ باش بزانت، و دینداریيا وی ب تێگەهشتن وعەقلەکێ ڤەکری بت، دا بشێت خزمەتا بنەمال و جڤاك و مللەتێ خوە بکەت.

٤- دڤێت گەنجێ موسلمان یێ دەهمەنپاقژ و خودان ڕەوشتەکێ بلند بت، و خوە ژ گونەهـ و سەرداچوونێ بپارێزت، و بەر ب ڤەخوارن و کارئینانا ماددەیێن بێهۆشکەر و مەی و جگارەکێشانێڤە نەچت، چونکی ئەو زیانێ دگەهیننە ساخلەمییا مرۆڤی، و ژ بلی حەرامییێ ژی، کارەکێ خراب ل ژیانا مرۆڤی و بنەمالێ و جڤاکێ دکەن.

٥- دڤێت گەنجێ موسلمان خودان کەسینییەکا هەڤسەنگ و ڕەحەت و خوەڕاگرتی بت، و خوە ژ وان هەمی تشتان بدەتە پاش یێن کاری ل کەسینییا وی دکەن.

٦- دڤێت گەنجێ موسلمان کەسەکێ کاریگەر و چالاك بت، و بەرنامە و پلانەکێ بۆ ژینا خوە بدانت، دا پێگاڤێن خوە ب دورستی بەر ب پاشەڕۆژێڤە بهاڤێژت.

٧- دڤێت گەنجێ موسلمان د سەرەدەرییا خوەدا د گەل دەیبابێن خوە نموونەیێ ڕێزگرتن و ڤیان و دلۆڤانییێ بت، هاریکارییا وان بکەت، و دلێ وان نەهێلت، و فەرمانێن وان ب جهـ بینت، و پشتەڤان و دلسۆزێ وان بت.

٨- دڤێت گەنجی موسلمان وەسا د دنیاییٚ بگەهت کو جهیٚ تۆڤچاندنێیە بۆ ئاخرەتیٚ، و ژیانا دنیاییٚ دەلیڤەیەکە بۆ پەرستن و کاریٚ چاك و هاریکاری و دلسۆزی و کارکرنیٚ بۆ چوونا بەهەشتیٚ.

٩- دڤێت گەنجیٚ موسلمان ییٚ دلسۆز بت بۆ گەل و مللەت و وەلاتیٚ خوە، و حەز ژ کوردستانی بکەت، و کاری بۆ ئاڤاکرن و پێشکەڤتنا ویٚ بکەت.

١٠- دڤێت ئەو دەمیٚ خوە ب تشتیٚ بێمفاڤە نەبۆرینت، و باش بخوونت و فێربوونیٚ وەك پەرستن ببینت، و ب ڤیان و حەزکرن بەردەوامیییٚ بدەتە خواندنا خوە.

# ڤیان و ڕەنگێن وێ

قوتابییێ هێژا، د ڤێ پشکێدا دێ بەحسێ دو ژ گرنگترین بهایێن ئیسلامێ کەین، ئەو ژی ڤیان و دلفرەهییە.

## ئێک: ڤیان

### پێناسەیا ڤیانێ:

ڤیان بناخەیێ ژیانێیە، و بێ ڤیان چو ژیان نابن، و ڤیان هەستەکا نازك و جوانە جهێ خوە د دلیدا دکەت، و سیبەرا خوە ددەتە هەمی ڕەخان، و ئەو هەستەکا نازکە یا تژی دلۆڤانی و شەوقە ژ دلێ مرۆڤی و نەفسا وی دەردکەڤت، و ژیان بێ ڤیان تشتەکێ بێ ڕامانە، و ئەگەر ئەو نەبت مرۆڤ نەشێت ژیانەکا کاریگەر بژیت، و ئەو دلێ ڤالا بت ژ ڤیانێ دلەکێ کاڤل و وێرانە، و ڤیان هەستەکا کوور و پاقژ و گەشە، ئێکا هند ژ مە چێ دکەت ئەم تامەکا خوەش ژ ژیانێ ببینین، و بەختەوەر ببین، و هەست ب تەناهییێ بکەین، و ب دلەکێ ڕەحەت بژین، و خێرێ بۆ خەلکی بخوازین و ب باشی سەرەدەرییێ د گەل وان بکەین.

بناخەیێن ڤیانێ:

**ڤیانێ سێ بناخە بۆ هەنە، ئەو ژی ئەڤەنە:**

١- هەستکرن ب بەرپسیارییێ: ئانکو مرۆڤ بەرانبەر وی کەسی یان وی تشتی یێ حەز ژێ دکەت هەست ب بەرپسیارییێ بکەت.

٢- ڕێزگرتن: ڤیانێ ڕێزگرتن پێڤە دئێت، و ڕێزگرتن ژ بەرهەمێ دارا ڤیانێیە، و ئەڤیندار ڕێزێ ل وی کەسی دگرت یێ ئەو حەز ژێ دکەت، و ب ڕەنگەکێ هەژی سەرەدەرییێ د گەل دکەت، و نەخوەشییێ ناگەهینتێ.

٣- مەردینی: ڤیان ژێدەرەکە بۆ مەردینی و قوربانیدان و ب هێزکرنا گیانێ خوەگۆریکرنێ، و ئەڤیندار دڤێت یێ مەرد بت د گەل وی یێ ئەو حەز ژێ دکەت.

## گرنگیدانا ئیسلامێ ب ڤیانێ:

ئایین - نەخاسمە ئایینێ ئیسلامێ - گرنگییەکا مەزن ددەتە ڤیانێ، و ئیسلام کاری بۆ بەلاڤکرنا ڤی بهایێ جوان د ناڤ مەدا دکەت، دا ژیانا مە بخەملینت، و ئەم ب گیانێ ڤیان و برایینی و دلۆڤانییێ سەرەدەرییێ د گەل ئێکدو و بنەمالێ و جڤاك و ژینگەها خوە بکەین، و ب چاڤێ حەژێکرنێ بەرێ خوە بدەینە ژیانێ، و فەرە ئەم بزانین کو موسلمانێ دورست دڤێت نموونەیێ ڤیانێ بت، و دلرەقی و کەرب و نەڤیانێ بهاڤێژت، چونکی پەرستنا خودێ و دینداری بێ ڤیان، وەکی لەشێ بێ ڕوحە، و بێ ڤیان مرۆڤێ دیندار چو تامێ ژ پەرستنێ نابینت، بەلکو دبت مەسەلە ڤاژی ببت و دژی ئارمانجێن ئیسلامێ ڕاوەستت ئەگەر هات و ب ڕەنگەکێ خەلەت هاتە ب کارئینان، و ببتە هێزەکا خرابکەر.

## جه و بهایێ ڤیانێ د ئیسلامێدا:

پەیڤا (حب) و ئەو پەیڤێن ژێ دئێنە وەرگرتن هەشتێ و چار جاران د قورئان و سوننەتێدا هاتینە، و ئەڤە وێ گرنگییێ دگەهینت یا ئیسلامێ دابییە ڤی بهایێ مرۆڤایەتییێ، و هەر ئەڤ چەندەیە ئەو ب ڕەنگەکێ ب هێز ب باوەری و کەسینی و هزرا مرۆڤێ موسلمانڤە گرێدایی، و کرییە پیڤەرەکێ گرنگ بۆ هەبوونا باوەرییێ.

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د گۆتنەکا خوەدا ڤیانێ وەك ڕێباز بۆ خوە دبینت، دەمێ دبێژت: ((الحب مذهبي و الصدق سلاحي)) ئانکو: ڤیان ڕێبازا منە و ڕاستی چەکێ منە. و ڕامانا ڤێ ئەوە دڤێت ڤیان ڕێبازا هەر موسلمانەکی بت د ژیانێدا.

و د فەرمۆدەیەکا دیدا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) ڤیانێ، نەخاسمە ڤیانا موسلمانان بۆ ئێکدو، دکەتە مەرجێ ڕازیبوونا خودێ و کلیلا بەهەشتێ، دەمێ دبێژت: ((لن تدخلوا الجنة حتى تؤمنوا، ولن تؤمنوا حتى تحابوا، ألا أدلكم على شيء إذا فعلتموه تحاببتم، أفشوا السلام بينكم)) ئانکو: هوون ناچنە بەهەشتێ هەتا هوون باوەرییێ نەئینن، و هوون باوەرییێ نائینن، هەتا هوون حەز ژ ئێکدو نەکەن، و ئەز بۆ هەوە تشتەکی نەبێژم ئەگەر هوون بکەن، هوون دێ حەز ژ ئێکدو کەن؟ سلاڤێ د ناڤبەرا خوەدا بەلاڤ بکەن.

و ئەڤە هندێ دگەهینت کو دڤێت موسلمان تێهنییێ ڤیان و دلۆڤانییێ بت، چونکی ئەوێ پەیوەندی ب دووماهییا وی و چوونا بەهەشتێڤە هەیە، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((لا یؤمن أحدکم حتی یحب لأخیه ما یحب لنفسه)) ئانکو: مرۆڤ باوەرییێ نائینت، هەتا خێر بۆ خەلکی هەمییان و نەخاسمە بۆ باوەرداران نەڤێت، ئەڤە دا مرۆڤ د دەرهەقا خەلکیدا خەلەت نەبت، دەمێ سەرەدەرییێ د گەل وان دکەت، و دادپەروەری هندێ دخوازت تو خوە بدانییە جهێ یێ بەرانبەر و پسیارا وی ڕەنگێ سەرەدەرییێ بکەی ئەوێ تە ژ کەسێ بەرانبەر دڤێت، دا تو ژی وی ڕەنگێ سەرەدەرییێ د گەل وی بکەی.

و دەمێ ئیسلام ب ڤی ڕەنگی گرنگییێ ددەتە ڤیانێ، وێ دڤێت ڤیانێ بۆ موسلمانی بکەتە سالۆخەت، و بۆ جڤاکێ بکەتە بناخە، و موسلمانی بەرانبەر کەرب و نەڤیانێ ڕاوەستینت، چونکی ئەو دژی ڤیانێنە. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((إیاکم و البغضاء فإنها لحالقة)) ئانکو: هشیاری نەڤیانێ بن چونکی ئەو باوەرییا مرۆڤی دتراشت، و پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((ولا تباغضوا)) ئانکو: کەربێن خوە ژ ئێکدو ڤەنەکەن، و دڤێت مرۆڤ حەز ژ زۆرداری و ستەم و خرابی و گونەهێ نەکەت، و نابت کەربێن وی ژ برایێن وی ڤەبن، چونکی ڕەهێن دارا باوەرییێ د ئاخا ڤیان و دلۆڤانی و دلفرەهی و برایینییێ ڕا کوور دداهێلایینە، زانایێ ناڤدار سەعیدێ نوورسی د گۆتنەکا خوەدا دبێژت: **((ژیانا دنیایێ گەلەک کێمترە ژ هندێ ئەم ژ هەمی دلێ خوە حەز ژ ئێکدو بکەین، ڤێجا پا تو بۆ هندێ چ دبێژی ئەم کەربێن خوە ژ ئێکدو ڤەکەین و ب چاڤێ کینێ بەرێ خوە بدەینە ئێکدو)).**

## ڕەنگێن ڤیانێ

### گەلەک ڕەنگێن ڤیانێ هەنە، ژ وان:

### ١- ڤیانا خودایێ مەزن:

ئاشکەرایە کو پەیوەندی د ناڤبەرا خودێ و بەنییێن ویدا - ب دیتنا ئیسلامێ - ل سەر بناخەیێ ڤیانێ ئاڤاکرییە، و دلێ مرۆڤی هەر ژ زارۆکینییا وی و ب خوەڕستییا خوە یێ تژییە ژ ڤیانا خودێ، و ئەڤ ڤیانە د گەل وی مەزن دبت، و چەند ئایەتێن قورئانێ هەنە ڤێ پەیوەندییێ ئاشکەرا دکەن، وەکی گۆتنا وی: ((إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ سَيَجْعَلُ لَهُمُ الرَّحْمَنُ وُدًّا)) (مریم: ٩٦)

ئانكو: ئەوێن باوەری ئینایین و چاکی کرین، خودایێ دلۆڤان دێ ڤیان و دلۆڤانییا خوه دەته وان.
هەر وەسا خودایێ مەزن دبێژت: ((وَاسْتَغْفِرُواْ رَبَّكُمْ ثُمَّ تُوبُواْ إِلَيْهِ إِنَّ رَبِّي رَحِيمٌ وَدُودٌ)) (هود: ٩٠)
ئانكو: داخوازا ژێبرنا گونەهان ژ خودایێ خوه بکەن، و ل وی بزڤرن، هندی ئەوە ئەو خودایێ دلۆڤان و خودان ڤیانە.

ئەگەر مرۆڤی باوەری و زانین هەبت ڤیانا وی بۆ خودێ دێ مەزن بت، و مرۆڤ ب پەرستنێ و کارێ خێرێ و قەنجییێ خوه نێزیکی خودێ دکەت، و ڤیانا خودێ د دلێ ویدا زێدەتر لێ دئێت، د فەرمۆدەیەکا قودسیدا یا ئیمامێ بوخاری ژ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ڤەدگوهێزت، دبێژت: خودایێ مەزن گۆت: ((.. وما يزال عبدي يتقرب إلي بالنوافل حتى أحبه، فإذا أحببته كنت سمعه الذي يسمع به، وبصره الذي يبصر به..)) ئانكو: بەنییێ من هند دێ ب کرنا سوننەتان خوه نێزیکی من کەت، هەتا ئەز حەز ژێ دکەم، و ئەگەر من حەز ژێ کر، ئەز دێ بمە ئەو گوهێ پێ دبهیست، و ئەو چاڤێ ئەو پێ دبینت.

و خودایێ مەزن د سالۆخەتێ موسلماناندا دبێژت: ((وَالَّذِينَ آمَنُواْ أَشَدُّ حُبّاً لِّلّهِ)) (البقرة: ١٦٥)
ئانكو: ئەوێن باوەری ئینایین پتر حەز ژ خودێ دکەن.

## ٢- ڤیانا پێغەمبەران:

ڤیانا پێغەمبەران چەڤەکە ژ ڤیانا خودێ، وەکی خودێ دبێژت: ((قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ)) (آل عمران: ٣١) ئانكو: ڤیانا خودێ بۆ مرۆڤی یا گرێداییە ب دووکەڤتنا ویڤە بۆ رێبازا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن)، و هەر کەسێ حەز ژ پێغەمبەری بکەت دێ ل دووڤ رێبازا وی چت، هنگی خودێ دێ حەز ژ وی کەت.

پێغەمبەر ئەو پرن یا مرۆڤی دگەهیننە خودێ، و ئەو بەرێ خەلکی ددەنە رزگاری و خێر و قەنجییێ، دا بەرێ وان بدەنە بەهەشتێ و وان ژ ئاگری بپارێزن، لەو ئەو هێژایی هندێنە مرۆڤ حەز ژ وان بکەت، و نەخاسمە پێغەمبەرێ مە (سلاڤ لێ بن) ئەوێ باوەرییا موسلمانی تەمام نابت هەتا ئەو ژ مال و مرۆڤ و نەفسا خوه پتر بڤێت، چونکی ئەو خوەشڤییێ خودێیە، و خودێ فەرمان ل مە کرییە کو ئەم حەز ژ وی بکەین.

## بۆچ دڤێت ئەم حەز ژ پێغەمبەرێ خوە بکەین؟

گەلەك ئەگەر هەنە ل سەر مە فەر دکەن کو ئەم حەز ژ پێغەمبەرێ خوە موحەممەد (سلاڤ لێ بن) بکەین، ل ڤێرێ دێ بەحسێ گرنگترین وان ئەگەران کەین:

أ- چونکی وی بەرێ مە یێ داییە ئیسلامێ، و ئەم ب ڤێ چەندێ ژ سەرداچوونێ هاتینە پارازتن، و دلێن مە ب ڕۆناهییا باوەرێ گەش بوون، وی بەرێ مە دا ڕێکا هەقییێ و ئەم ژ کوفرێ قورتال (ڕزگار) کرن، ڕێکا هەقییێ و چوونا بەهەشتێ نیشا مە دا، و ئەم ژ ڕێکا ئاگری دانە پاش.

ب- دلێ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) یێ تژی بوو ژ ڤیانێ بۆ موسلمانان، خوە ئەو موسلمانێن وی نەدیتین ژی، جارەکێ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆت: ((خوەشڤییێن من خوەشڤییێن من)) هەڤالێن وی گۆتێ: ما ئەم نە خوەشڤییێن تەینە؟ وی گۆت: ((هوون هەڤالێن منن، و خوەشڤییێن من ئەوون ئەوێن ئەز نەدیتیم و باوەرییێ ب من دئینن)). و دلێ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گەلەك بۆ وان موسلمانان دئێشا ئەوێن ب ڕەنگەکێ دورست پەرستن نەدکرن، یان ل دووڤ ڕێبازا وی نەدچوون، و ئەگەر موسلمانان زانیبا کانێ پێغەمبەرێ وان چەند حەز ژ وان دکەت، ئەو دا پتر حەز ژێ کەن، و دا شەرمێ ژ خوە کەن دەمێ سستی د دینێ ویدا دکرن، خودایێ مەزن دبێژت: ((بِالْمُؤْمِنِينَ رَؤُوفٌ رَّحِيمٌ)) (التوبة: ١٢٨) ئانکو: پێغەمبەر یێ دلۆڤان و مهرەبانە د گەل باوەرداران.

ج- پێغەمبەر (سلاڤ لی بن) گەلەك یێ ڕژدبوو ل سەر پارازتنا موسلمانان ژ ئاگری، لەو وی بەرێ وان ددا بەختەوەرییا دنیایێ و ئاخرەتێ، و وی د گۆتنەکا خوەدا مەتەلەك ل سەر ڤێ ڕژدبوونا خوە ئینایییە، دەمێ دبێژت: ((مەتەلا من و ئوممەتا من، وەکی مەتەلا زەلامەکییە ئاگرەك هلکری، و گیانەوەر و بەلاتینك هاتن دا خوە بهاڤێژنێ، ومن دڤێت ئەز وان ژ ئاگری بدەمە پاش و ئەو خوە دهاڤێژنێ)). و ژ نموونەیێن ڕژدییا وی ل سەر قورتالکرنا مە ڕۆژا ڕابوونێ ئەو مەهدەرێ بۆ مە دکەت، دا مە ژ دۆژەهێ بپارێزت، لەو ئەگەر ئەم پیچەکێ هزرا خوە بکەین دێ بینین کو پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) دل ب مەڤە بوو و دوعا بۆ مە دکرن، و وی ب پەیاما خوە دڤیا ئەم خودێ بپەرێسین، و خوە ژ گومانێ بدەینە پاش.. ئەرێ ما پێغەمبەرەکێ هۆسا هێژایی هندێ نینە ئەم حەز ژێ بکەین؟

### ٣- ڤیانا مرۆڤی بۆ خوە:

مرۆڤەك نینە كو حەز ژ خوە نەكەت، بەلكو تشتێ ژ هەمیییێ گرنگتر ئەوە مرۆڤ حەز ژ خوە بكەت، چونكی ئەگەر ئەو حەز ژ خوە نەكەت خەمێ ژ خوە ناخوت، و خوە ناپارێزت، و دێ نەفسا خوە تێ بەت، و ئەڤ ڕەنگێ ڤیانێ د دلێ هەر مرۆڤەكیدا هەیە، خودایێ مەزن دبێژت: ((عَلَيْكُمْ أَنفُسَكُمْ..)) (المائدة: ١٠) ئانكو: هەوە های ژ خوە هەبت، گرنگییێ بدەنە خوە.

و دڤێت بزانین كو حەژێكرنا مرۆڤی بۆ خوە یا جودایە ژ ئەزئەزیییێ، كو ئەو سالۆخەتەكێ خرابە و ئیسلامێ نەڤێت.

### ٤- ڤیانا تشتێن بەرجەستە (الأشياء الملموسة):

ئەو تشتێن مرۆڤ دبینت، وەكی: ڕەنگێن خوارنی، و جلكان، یان دیمەنەكێ سروشتی، مرۆڤەكێ جوان، ستێرێن ئەسمانی یێن مرۆڤی حێبەتی دكەن، ڕەنگێ ئافراندنا مرۆڤی و چێكرییێن دی وەكی عەور و گول و باران و بەفر و هتد.. ژ وان تشتێن مرۆڤ ب چاڤ دبینت. و دبت مرۆڤی گوهـ لێ ببت وەكی: دەنگەكێ خوەش، شعرەكا شرین، خواندنا قورئانێ ژ بەرێ كەسەكێ دەنگخوەشڤە، یان ئاوازەكا دلڤەكەر. یان ژی ب ڕێكا دەستكرنێ وەكی: تشتەكێ نەرم، یان هەمبێزكرنا كەسەكێ خوەشڤی، وەكی: زارۆكەكی یان هەڤالەكی.

### ٥- ڤیانا دەیبابان بۆ زارۆكێن خوە:

ئەو ڤیانا خودێ كرییە د دلێن دەیباباندا بۆ زارۆكێن وان، وە ل وان كرییە كو ئەو د گەل وان دلۆڤان بن، و ب هەمی ڕەنگێن وەستیان و نەخوەشیییێ د ژیانێدا ڕازی ببن، دا زارۆكێن وان سەركەڤتی و بەختەوەر ببن د ژیانا خوەدا، خودایێ مەزن ڤیانا زارۆكان كرییە پشكەك ژ دلۆڤانییا خوە یا وی كرییە د دلێ دەیباباندا، و ئەڤەیە ڤیانا ڕاست و دورست، چونكی ئەو ڤیانەكا بێ بەرانبەرە، و دەیباب ئامادەنە ب هەر وەستیان و نەخوەشییەكا هەبت ڕازی ببن وەك خوەگۆریكرن بۆ زارۆكێن خوە، لەو دڤێت زارۆك ڤێ چەندێ بزانن و ڕێزێ ل دەیبابێن خوە بگرن، و ڤیانا خوە بۆ وان زێدە بكەن، دا بنەمال ب خوەشی بژیت.

## ٦- ڤیانا ژن ومێران:

خودایێ مەزن د شەریعەتێ خوەدا گرنگییەکا مەزن داییە ڤیانا مرۆڤی ژن بت یان مێر، و دەمێ کورەکی کچەك بڤێت ئەو دشێت وێ بۆ خوە بینت و پێکڤە بنەمالەکێ ئاڤا بکەن، و د چارچۆڤێ بنەمالێدا ڤیانا ژن و مێران بۆ ئێکدو ڕۆژ بۆ ڕۆژێ زێدەتر لێ دئێت، و ئەو بەرهەڤ دبن کو خوە گۆری هەڤ بکەن، و پێکڤە کاری بۆ دورستکرنا بنەمالەکا سەرکەڤتی بکەن، و هەبوونا زاڕۆکان ژی ڤیانێ د ناڤبەرا واندا زێدە دکەت، و ئەو کاری بۆ ئامادەکرنا هندەك کەسێن مفادار بۆ جڤاکێ ب ڕێکا پەروەردەکرنا زاڕۆکێن خوە دکەن.

ڤیانا مێری بۆ ژنێ ب دیتنا ئیسلامێ تشتەکێ پیرۆزە، و دڤێت ئەو خیانەتێ ل وێ ڤیانێ نەکەن، و هەر کەسەکێ خیانەتێ بکەت دێ تووشی ئیزایا خودێ بت، و هەژییە بێژین ئەو پەیوەندییا حەژێکرنێ ئەوا د ناڤبەرا کور و کچێدا پەیدا دبت، ئەگەر ئارمانج ژێ ئەو نەبت بنەمالەك بێتە پێکئینان و دورستکرن، و سنج و ڕەوشتێن ئیسلامێ بەرچاڤ بێنە وەرگرتن، ئەو پەیوەندییەکا دورست نینە و نائێتە قەبوولکرن..

و ل سەر قوتابییان فەرە ئەو ل قوتابخانەیێ و ژ دەرڤە ژی ب گیانێ برایینی و هەڤالینییێ سەرەدەرییێ د گەل ئێکدو بکەن، و ب چاڤێ ڕێز و قەدرگرتنێ بەرێ خوە بدەنە ئێکدو، و وەکی خووشك و برا ناڤ و دەنگێ ئێکدو بپارێزن، و کاری بۆ سەرکەڤتنێ بکەن، و خوە ب خواندن و وانە و چالاکییێن مفادارڤە مژوول بکەن. و دڤێت کوڕان - هەروەسا کچان ژی - خێر بۆ هەڤالێن خوە بڤێن، کانێ چاوا وان ئەو بۆ خووشك و برایێن خوە دڤێت، چونکی کوڕ و کچ د ئیسلامێدا خووشك و برایێن ئێکدونە، و ئیسلام فەرمانێ ل مە دکەت کو مە خێر بۆ ئێکدو بڤێت.

## ٧- ڤیانا ڕەوشت و کارێ چاك:

قەنجی، و مەردینی، و درێژکرنا دەستێ هاریکارییێ، و ڕێزگرتن ل کەسێ بەرانبەر، و پاقژییا دلی، و دەهمەنپاقژی، و زیرەکی، و سەرەدەرییا باش.. ئەڤە کۆمەکا ڕەوشت و سالۆخەتێن چاکن یێن هەر مرۆڤەکێ تێگەهشتی بهایی ددەتێ و ڕێزێ لێ دگرت، و هەر کەسێ ئەڤ ڕەوشتە ل نك هەبن مرۆڤ دێ حەز ژێ کەن، و دڤێت ئەم خوە بکەینە ژ وان کەسان ئەوێن مرۆڤ حەز ژێ دکەن، و بزاڤێ بکەین کو هەمی ڕەوشت و سالۆخەتێن باش، ل نك خوە پەیدا بکەین، هەر وەسا دڤێت ئەم حەز ژ مرۆڤێن قەنجیکار بکەین، ژ بەر کو خودێ ژی حەز ژ وان دکەت، وەکی د ئایەتەکێدا هاتی: ((وَاللَّهُ يُحِبُّ الْمُحْسِنِينَ)) (المائدة: ٩٣، آل عمرن: ١٣٤ و ١٤٨).

## ٨- ڤیانا وەلات و گەل و مللەتی:

فەرە ل سەر موسلمانی حەز ژ گەردوون و سروشتی ب گشتی بکەت، و هەر مرۆڤەك حەز ژ ئەرد و وەلات و جهێ بوون و مەزنبوونا خوە دکەت، و ئیسلام ڕێکێ ل ڤێ حەژێکرنێ ناگرت، و وێ ب تشتەکێ سروشتی دبینت ب مەرجەکێ نەبتە ئەگەرا هندێ کو مرۆڤ کەربێ ژ مللەت و وەلاتێن دی ڕاکەت، و دەمێ کۆتەکی ل پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) هاتییە کرن کو مەکەهێ بهێلت و مشەخت ببت، هنگی ئەو ل مەکەهێ زڤڕی و گۆتێ: ((ئەز ب خودێ کەم تو خوەشڤیترین ئەردێ خودێیی ل بەر من، و ئەز ب وی کەم ئەوێ نەفسا من د دەستاندا، ئەگەر خەلکێ تە ئەز نەچاری (مەجبووری) دەرکەڤتنێ نەکربام من تو نەدهێلایی)).

و ژ نیشانێن ڤیانا وەلاتی ئەوە مرۆڤ کاری بۆ وەرار و سەرکەڤتنا وی بکەت، و بەرەڤانییێ ژێ بکەت دژی نەیاران.

## ٩- ڤیانا برایینییێ (ڤیانا مرۆڤی بۆ خەلکی):

هەمی ئایینێن ئەسمانی، و ئیسلام ئێك ژ وانە، گەلەك گرنگییێ ددەنە ڤیانا برایینییێ، و مەرەم ب ڤی ڕەنگێ ڤیانێ ئەوە، مرۆڤ هەست ب بەرپسیارییێ بکەت بەرانبەر خەلکێ دی، و ڕێزێ ل وان بگرت، و کاری بۆ بەختەوەری و خوەشکرنا ژیانا وان بکەت، و بناخەیێ ڤێ ڤیانێ برایینییا مرۆڤاتییێیە، وەکی ئیمام عەلی (خودێ ژێ ڕازی بت) دبێژت: ((مرۆڤ دو دەستەکن: یان د ئایینێدا برایێن ئێکن، یان د مرۆڤینییێدا وەکی ئێکن)) و ئەڤ ڕەنگێ ڤیانێ ل دووڤ ڕێنماییێن ئیسلامێ چو جوداییێ نائێختە ناڤبەرا مرۆڤان و گرنگییێ نادەتە نفش و ئایین و ڕەنگ و ڕەگەزێ وان، لەو ئێك ژ بەرهەمێن ڤێ ڤیانێ ئەوە، دلفرەهی بەرانبەر مرۆڤان پەیدا دبت.

و ئەڤ ڤیانە مرۆڤی ژ دەمارگیری و دژمنایی و کەرب و کینێ دوور دئێخت، و وە ل مرۆڤی دکەت ب خشکۆکی و سنگەکێ فرەهـ سەرەدەرییێ د گەل غەیری خوە بکەت، چونکی مرۆڤ چ بن و چاوابن، د بنیاتدا مرۆڤن خودێ ب بها ئێخستینە و ڕوح داییە وان، و ئەو بەندەیێن ئێك خوداینە، و ژێدوەرێ وان ئێکە، کو خودێیە و دێ هەر ب بال ویڤە زڤڕنەڤە، و ئەگەر خوە دژمنێن خودێ و مرۆڤانییێ ژی بن، دڤێت سەرەدەری د گەل وان ب ئاوایەکی تایبەت بێتە کرن.

ژ بەر ڤێ چەندێ دەمێ ئەم حەز ژ خەلكێ دی دكەین، ئەو ئەم ب ڕەنگەكێ نەئێكسەر حەز ژ خودێ دكەین، چونكی مرۆڤ چێكرییێن خودێنە، وی ئەو ژ دەیك و بابەكان دایینە، و ئەوە فەرمانێ ل مە دكەت كو ئەم حەز ژ مرۆڤان بكەین، و بهایی بدەینە وان، و پشكدارییێ د خوەشی و نەخوەشییێن واندا بكەین.

## دان و ستاندن:

ڕۆلێ ڤیانێ د كێمكرنا گرفتارییێن مرۆڤان و دلخوەشكرنا واندا چیە؟

## پسیار:

١- ئەو تشت چنە ئەوێن ڤیانا خودێ بۆ مە زیدە دكەن؟

٢- سەرەدەری د گەل موسلمانان و خەلكێ دی ژی ل سەر بناخەیێ ڤیانێ كارەكێ باشە، ئەرێ خێرا وێ چەندێ ل دنیایێ و ئاخرەتێ چیە؟

٣- پەیوەندییا ڤیانێ ب چوونا بەهەشتێڤە چیە؟

## ڤەكۆلان:

تو چاوا دێ پەسند كەی كو ئیسلام دین و ئایینێ ڤیانێیە، و پەیوەندی د ناڤبەرا خودێ و بەنییێن ویدا ل سەر ڤیانێ ئاڤاكرییە؟

# دلفرەهی

و ئەڤە بهایێ دوییێیە، و مەرەم پێ ئەوە مرۆڤ ب دلەکێ فرەهـ و دلۆڤانی سەرەدەرییێ د گەل کەسێ بەرانبەر بکەت، و رێزێ ل ماف و ئازادییا وی و بۆچوونێن وی یێن جودا بگرت، و خوە دوور بێخت ژ کەرب و کین و توند و تیژی و قەبوولنەکرنا یێ دی.

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((بعثت بالحنيفية السمحة)) و ژ ڤێ فەرمۆدەیێ بۆ مە ئاشکەرا دبت کو ئیسلام ئایینێ دلفرەهییێیە، و دلفرەهییێ بهایەکێ گرنك د ئیسلامێدا هەیە، و دلفرەهییا مرۆڤی ژ هندێ دئێت، د گەل کەسێ دی، ئەو ڤەکری بت، باوەرییێ ب هەبوون و ئازادییا وی بینت، و مافێ وەلاتینییێ بۆ پەسند بکەت، و چو جوداهییێ، ب هێجەتا نفش و ئایین و نەتەوەیان، نەئێختە ناڤبەرا مرۆڤان.

ئیسلامێ باوەری ب هەبوونا هەمی ئایینان هەیە، خودایێ مەزن دبێژت: ((آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ كُلٌّ آمَنَ بِاللّهِ وَمَلآئِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لاَ نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ وَقَالُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ)) (البقرة: ٢٨٥) و ئاشکەرایە کو دلفرەهی وێ ڕامانێ نادەت تو ب سەر چو تایانڤە نەبی، یان ئایین و بیر و باوەرێن خوە بهێلی، بەلکو هندێ دگەهینت، تە باوەری ب هەبوونا خەلکێ دی هەبت، و دڤێت ماف و ئازادییێن وان بۆ بێنەدان، وەکی ئیسلامێ نیشا مە دایی.

ئیسلامێ باوەری ب پێکڤەژیانا مللەت و ئایین و نفشان هەیە، و کەسێن بەرانبەر د گەورییێدا دچن و وان ب سنگفرەهی قەبوول دکەت و سەرەدەرییێ د گەل وان دکەت، و ب مرۆڤاییینی د گەل وان دژیت. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((الدين هو المعاملة)) ئانکو: ئایین سەرەدەرییە.

عوبادەیێ کوڕێ صامتی دبێژت: پسیار ژ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) هاتەکرن: چ کار ژ هەمییان باشترە؟ گۆت: باوەری ب خودێ و خەبات د رێکا ویدا. گۆت: مە پسیارا کارەکێ ساناهیتر ژێ کر، گۆت: دلفرەهی و کەرب دەرنەئێخستن.

## ڕەنگێن دلفرەهییێ

### گەلەک ڕەنگێن دلفرەهییێ هەنە، ژ وان:

### ١- دلفرەهییا ئایینی:

ئانکو: ژیانا د گەل دووکەڤتییێن ئایینێن دی، ب ڕێکا دانا ئازادییێ بۆ وان کو ڕێ و ڕەسمێن خوە یێن ئایینی بگێڕن، خودایێ مەزن دبێژت: ((لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)) (الممتحنة: ٨) ئانکو: خودێ هەوە ژ وان نادەتە پاش ئەوێن شەڕێ هەوە د دینیدا نەکرین و هوون ژ وارێ هەوە دەرنەئێخستین، کو هوون قەنجی و دادییێ د گەل وان بکەن.. و ل سەر موسلمانی فەرە باوەرییێ ب هەمی کتێبێن ئەسمانی بینت، چونکی گۆتنا خودێیە بۆ پێغەمبەرێن وی هاتی، و ئەو کتێب چارن: (قورئان، تەورات، زەبوور، ئنجیل) و ژ بلی ڤان دڤێت ماف و ئازادییا دووکەڤتییێن ئایینێن دی ژێ پارزتی بت، چونکی قورئان ژ موسلمانان دخوازت سەرەدەرییەکا باش د گەل خەلکێ دی بکەن، دا بەرێ وان بۆ باوەرییێ بێتە دان، دڤێت ب جوانترین ڕەنگ دان و ستاندن بێتە ب کارئینان، وەکی خودایێ مەزن دبێژت: ((ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُم بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ إِنَّ رَبَّكَ هُوَ أَعْلَمُ بِمَن ضَلَّ عَن سَبِيلِهِ وَهُوَ أَعْلَمُ بِالْمُهْتَدِينَ)) (النحل: ١٢٥) ئانکو: ب تێگەهشتن و شیرەتا باش دان و ستاندنێ د گەل وان بکە.. هەر وەسا ئیسلام ل سەر بناخەیێ باوەری ب ئازادییێ، سەرەدەرییێ د گەل کەسێ دی دکەت، و هەر کەسەك ئازادە د هلبژارتنا دینێ خوەدا، و نابت کۆتەکی ل کەسێ بێتەکرن، چونکی دین (ئایین) بۆ ڕۆژا دووماهییێیە، و هەچییێ وی ب ئازادی هلنەبژێرت، ل ڕۆژا دووماهییێ چو مفایی ژێ نابینت، وەکی د ئایەتەکێدا هاتی: ((لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ)) (البقرة: ٢٥٦) ئانکو: کۆتەکی د دینیدا (د ئایینێدا) نینە.

دەمێ عومەرێ کوڕێ خەتاب (خودێ ژێ ڕازی بت) باژێڕێ قودسێ ڤەکری، وی ئازادییەکا تەمام دا مەسیحییێن خەلکێ قودسێ، و سۆز دا وان، کو وان بپارێزت، و گۆتە هەڤالێن خوە: ((نەچنە د مالێن وانڤە، و وان ژێ دەرنەئێخن، و ئاڤاهییێن وان نەهەرڕێڤن، و چو مالێ وان، ژ وان نەستینن، و نابت هوون کۆتەکییێ ل وان بکەن دا ئایینێ خوە بهێلن)).

### ٢- دلفرەهییا هزری:

ئانکو: گوهدارییا بیر و بۆچوونا کەسێ دی بێتەکرن، و بۆ تێگەهشتنا وی پال ل سەر دان و ستاندن و هەڤپەیڤینێ بێتەدان، و بیر و بۆچوونا جودا بێتە قەبوولکرن، و دیرۆك شاهدە کو ئیسلامێ ب مرۆڤایەتی سەرەدەری د گەل هزرا جودا کرییە، و ئیسلامێ باوەری ب ئجتهادێ هەیە، و ئەڤە هندێ دگەهینت، کو ئیسلامێ باوەری ب جودابوونا بیر و بۆچوونان هەیە، و د دیرۆکا ئیسلامێدا ب دەهان مەزهەبێن فقهی و هزری و فەلسەفی پەیدابوویینە، هەتا هندەك جاران کەسێن نەموسلمان ژی، ل مزگەفتان دان و ستاندن دکرن و دەربڕین ژ هزر و بیر و بۆچوونێن خوە دکرن.

### ٣- دلفرەهییا نەتەوەیی:

ئانکو نەتەوەیێن ژێك جودا ڕێزێ ل ماف و کەرامەتا ئێکدو بگرن، و چو نەتەوەخواز دەمارگیری و توخمپەرێسییێ دژی نەتەوەیێن دی نەکەن، و ب چاڤەکێ کێم و بێ بها بەرێ خوە نەدەنە مللەتێن دی، و زۆرداریێ ل وەلات و مافێن وان نەکەن، خودایێ مەزن دبێژت: ((**يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّا خَلَقْنَاكُم مِّن ذَكَرٍ وَأُنثَى وَجَعَلْنَاكُمْ شُعُوباً وَقَبَائِلَ لِتَعَارَفُوا إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِندَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ**)) (الحجرات: ١٣) ئانکو: گەلی مرۆڤان مە هوون ب گەلەك ڕەنگ و نەتەوەیێن ژێك جودا دایینە، دا هوون ئێکدو بناسن، و یێ ژ هەوە هەمییان چێتر ل نك خودێ، ئەوە ئەوێ تەقوادار، و خودێیە زانا و شارەزا ب ڤێ چەندێ.

ئەڤ ئایەتە، و هندەك ئایەتێن وەکی وێ ئاماژەیێ ددەنە جودابوونا نەتەوەیان، بەلێ ئەڤ جودابوونە - وەکی ژ ڤێ ئایەتێ دئێتە وەرگرتن - دڤێت نەبتە ئەگەرا پەیدابوونا کەرب و نەڤیان و توخومپەرێسییێ د ناڤبەرا واندا، بەلکو دڤێت ئەو کاری بۆ هەڤناسینێ بکەن، و دووماهییا ئایەتێ مە ئاگەهدار دکەت کو ل نك خودێ، چو مللەت ژ چو مللەتان چێتر نینن. و وەکی پێغەمبەر ژی (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((**لا فضل لعربى على أعجمى و لا لأبيض على أسود إلا بالتقوى**)) ئانکو: کەس ژ بەر نەتەوەیا خوە یان ڕەنگێ خوە، ژ غەیری خوە چێتر نینە، پیڤکێ باشی و چێترییێ تنێ تەقوایە.

**بناخەيێن دلفرەهييێ د ئيسلامێدا:**

١- ب ديتنا ئيسلامێ ئايينێن ئەسمانی هەمييان ئێك ژێدەر هەيە، و ئەو هەمی ژ نك خودێ هاتينە، هەر چەندە هندەك ژ وان - ب گۆتنا قورئانێ - پێن هاتينە گوهارتن ژی، لەو نابت بۆ كەسەكی ب ناڤێ ئايينی نەيارەتييا كەسەكێ دی بكەت، يان وی كێم ببينت.

٢- ب بۆچوونا ئيسلامێ پێغەمبەر هەمی برانە، و دڤێت موسلمان باوەرييێ ب وان هەمييان بينت، و ئەگەر ئەو وە نەكەت باوەرييا وی دێ يا كێم بت.

٣- ب ديتنا ئيسلامێ مرۆڤ ئايينێ خوە ب ئازادی هلدبژێرت، و كۆتەكی د ئايينێدا نابت، و بير و باوەرێن ئايينی ب دل و ڤيان دئێنە وەرگرتن، و دڤێت رێز ل دووكەڤتييێن ئايينێن دی بێتە گرتن: ((**لاَ إِكْرَاهَ فِي الدِّينِ**)) (البقرة: ٢٥٦) ئانكو: كۆتەكی د ئايينێدا نينە. ((**وَقُلِ الْحَقُّ مِن رَّبِّكُمْ فَمَن شَاء فَلْيُؤْمِن وَمَن شَاء فَلْيَكْفُرْ**)) (الكهف: ٢٩) ئانكو: تو بێژە: هەقی ژ خودايێ تەيە، ئەوێ بڤێت بلا باوەرييێ بينت، و ئەوێ بڤێت بلا كافر ببت.

٤- ئيسلام ژ موسلمانان دخوازت ئەو ب چاڤێ مرۆڤينييێ بەرێ خوە بدەنە خەلكێ دی، و دان و ستاندنێ د گەل وان بكەن، و ب چاڤێ رێزگرتنێ بەرێ خوە بدەنێ، رۆژەكێ تەرمێ مرييەكێ د بەر پێغەمبەريرا هاتە برن، ئەو پێشڤە رابوو، ئێكی گۆت: ئەو زەلامەكێ جوهی بوو، پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆتێ: ((ما نە مرۆڤە!)) ئانكو: چونكی مرۆڤە و خودێ يێ ئافراندی دڤێت رێز لێ بێتەگرتن.

٥- جودابوونا ئايينان جهێ رێزگرتنێيە د ئيسلامێدا، و دووكەڤتييێن وان ماف هەيە پەرستگەهێن خوە هەبن، و ناسنامە و رەوشەنبيرييا خوە يا ئايينی بپارێزن، و نابت بۆ كەسێ مافێن وان بخون، و بناخەيەكێ ئوسوولی هەيە دبێژت: (**وان بهێلن بلا ئەو وەكی خوە پەرستنا خوە بكەن و بلا ل دووڤ دين و ئايينێ خوە ژين و ژيارا خوە ب رێڤە ببەن**).

٦- دڤێت موسلمان رێزێ ل نەموسلمانان بگرن، و ب جوانی سەرەدەرييێ د گەل وان بكەن، و ب هەمی رەنگان قەنجييێ د گەل وان بكەن، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((من آذى ذميا فأنا خصمه)) ئانكو: هەر كەسەكێ نەخوەشييێ بگەهينتە كەسەكی ژ ئايينێن دی ئەوێن د گەل مە دژين، ئەز دەعوەدارێ ويمە، و دبێژت: ((**ألا من ظلم معاهدا أو انتقصه أو كلفه فوق طاقته، أو أخذ منه شيئا بغير طيب نفس فأنا حجيجه يوم القيامة**)) ئانكو: هەر كەسەكێ زۆردارييێ ل كەسەكی ژ ئايينێن دی، ئەوێن د گەل مە دژين بكەت، يان وی كێم بكەت، يان بارەكێ زێدەيی شيانا وی لێ بكەت، يان بێ دلێ وی، تشتەكی ژێ بستينت، رۆژا رابوونێ ئەز دەعوەدارێ ويمە.

٧- د ئیسلامێدا نابت نەیارەتی د ناڤبەرا موسلمان و نەموسلماناندا بێتە ئاراندن، ل سەر بناخەیێ ئایینی، چونکی ئەو هەمی د مرۆڤینییێدا برانە، و دڤێت ئەو د گەلێك بژین و رێزێ ل ئێکدو بگرن، و مافێ ئێکدو نەخون، خودایێ مەزن دبێژت: ((لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُم مِّن دِيَارِكُمْ أَن تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ)) (الممتحنة: ٨) ئانکو: خودێ هەوە ژ وان نادەتە پاش ئەوێن شەرێ هەوە د دینیدا نەکرین و هوون ژ وارێ هەوە دەرنەئێخستین، کو هوون قەنجی و دادییێ د گەل وان بکەن، چونکی خودێ دادوەرە و حەز ژ وان کەسان دکەت، ئەوێن دادپەروەرییێ دکەن.

### دان و ستاندن:

چاوا ئەم دێ شێین خوە فێری دلفرەهییێ بکەین؟

### پسیار:

دەمارگیری و هەستا نەیارەتییێ کو دژی دلفرەهییێنە، چ زیانێ دگەهیننە مرۆڤ و جڤاکێ؟

### پێشنیار:

بەحسێ بەلگەیەکی بکە ل سەر دلفرەهییا ئیسلامێ د گەل ئایینێن دی، کو تە ل باژێرێ خوە دیتبت.

# بنەمال (الأسرة)

بنەمال: گرنگترین دەزگەها پەروەردەیی و جڤاکییە و بناخە و بنسترا پێکئینانا جڤاکێیە. ژ دەیباب و زارۆك و نەڤییان پێك دئێت و لاندکا ڤیان و رێز و وەرارکرن و دلۆڤانیێیە، و ئەندامێن وێ خودانێن کۆمەکا ماف و ئەرکانە بەرانبەر ئێکدو. مرۆڤ ب سروشتێ خوە هوومرۆڤە و حەز دکەت د گەل غەیری خوە بژیت. دورستکرنا بنەمالێ ڤێ داخوازێ ب جهـ دئینت و مرۆڤی ژ گۆشەگیری و تنێیاتییێ قورتال دکەت و تەناهی و ئارامییێ دسپێرتێ.

### ١- پێکئینانا بنەمالێ د دیتنا ئیسلامێدا:

بێ گومان بنەمالێ دەورەکی مەزن د ژیانا کەس و کۆماندا هەیە، د بنەمالێدا ژن و مێر ئێکدو تەمام دکەن و بێ ئێکدو نەشێن ب تەناهی بژین، هەروەسا تاك ژی ب کورو و کچڤە، هەتا بنەمالێ پێك نەئینن، هەست ب تەناهی و ئارامییەکا بەردەوام ناکەن، نەمازە ئەگەر بارا وان د دورستکرن و سەرێکڤەئینانا بنەمالێدا سەرکەڤتن و بەختەوەری بت. هەر ژ بەر هندێ ئیسلام ژی ب چاڤەکی پڕپووتە و گرنگی، بەرێ خوە ددتە بنەمالێ و دڤێت ل سەر بناخەیەکا ڕاست و موکوم بنسترێ بۆ دانت، و ئەرك و مافێن ئەندامێن وێ ب جوانی دیار و ئاشکەرا بکەت، هەروەسا ب ڤی ئاوایی پارێزکارییێ لێ دکەت و بەهایێن وێ دپارێزت و وەرارێ ددەتێ. ئیسلام ل سەر ڤی بناخەیی مە بۆ دورستکرنا بنەمال و هەڤسەرگیرییێ پال ددەت.

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د ڤی واریدە، دبێژت: ((النکاح من سنتی، فمن لم یعمل بسنتی فلیس منی))، ئانکو: ژنئینان و شووکرن و هەڤسەرگیری ژ ڕێبازا منە و هەر کەسێ کار پێ نەکەت و خوە ژێ بدەتە پاش، نە ژ منە.

هەروەسا د فەرمۆدەیەکا دیدا دبێژت: ((تزوجوا ولا تکونوا کرهبانیه النصاری))، ئانکو: هەڤسەرگیرییێ بکەن و وەکی وان مەسیحییان نەبن، ئەوێن پشت داییـنە ژیانا دنیایێ و شووناکن و ژنێ نائینن.

هەروەسا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د ڕوویێ خۆرت و گەنجاندا دبێژت: ((گەلی گەنجان، هەر کەسێ ژ هەوە پێ چێ ببت و بشێت بلا ژنێ بینت، چونکی چاڤ و دەهمەنان دپارێزت، ئەوێن نەشێن بینن ژی، بلا ڕۆژییان بگرن، یان ژی خوە بگرن هەتا دەلیڤەیا ژنئینان و شووکرنێ هلدکەڤت)).

خودایێ مەزن خوەرسك و بەهرەیا گونهێلێ د هەردو ڕەگەزاندا (نێر و مێ) دورستکرییە و هەست دکەن کو وان پێدڤی ب ئێکدو هەیە و ئێکدو تەمام دکەن. ئیسلام وەکی هندەك ئایینان داخوازێ ژ مرۆڤی ناکەت، کو دەستان ژ دنیایێ و خوەشییێن وێ بەردەت، و ژ وان خوەشییا گونهێلێ، بەلکو داخوازێ ژێ دکەت، ڤێ خوەرسکێ د گەل بێن دی، د چارچۆڤێ ڕەوشت و بەهاییێن بلندێن جڤاکی و ئارمانجێن ڕاستدا و ل دووڤ شەریعەتا ئیسلامی تێر بکەت.

هەڤسەرگیری و پێکئینانا بنەمالێ، ئەو چارچۆڤێ شەرعی و یاسایی و ئەخلاقییە، ئەوێ ڤێ ئارمانجێ د گەل کۆمەکا ئارمانجێن دی ب جه دئینت، مرۆڤی ژ ڕێدەرکەڤتن و گونەهێ دوور دئێخت، و وەلێ دکەت کو تامێ ژ ژین و ژیارێ وەربگرت و خودایێ خوەژی ژ خوە ڕازی بکەت. هەروەسا د جڤاکێدا ژی، ب سەرفرازی بژیت و ناڤ و ناڤدەنگێ خوە و یێ بنەمالا خوە بپارێزت.

## ٢- هلبژارتنا هەڤسەری:

هلبژارتنا هەڤگیان و هەڤسەرێ ژیانێ، دۆزەکا گەلەك گرنگە و پاشەڕۆژا بنەمالێ پێڤە گرێداییە، بنەمال ژی، دا دەورێ ژێ داخوازکری بگێڕت، و ل سەر بناخەیەکا ڕاست و موکوم بێتە ئاڤاکرن، دڤێت ژ پێگاڤا ئێکێ یا پێکئینانا خوە، هزرەکا هوورك بۆ بێتە کرن و نەخشە بۆ بێتە داڕێتن، چونکی هەر تشتەکێ ژ ڕێڤە ب دورستی دەست پێ نەهاتە کرن، پاشتر هەوجەیی هێز و شیانەکا گەلەك دبت ژ بۆ ڕاستکرنا وێ.

پێگاڤا ئێکێ یا بنەمالێ ژی، دیارکرنا هەڤسەرێ پاشەڕۆژێیە، هەر ژ بەر هندێ ئیسلام گەلەك قەویاتییێ لێ دکەت، و داخوازێ ژ مە دکەت، ئەم ژ ڤی ئالیڤە هشیاربین و بڕیارا ڕاست بدەین و ب ڕوویێ ب سەرڤە، نەئێینە خاپاندن، ئاشکەرایە ئەو بناخە و پیڤکە ژی، ئەوێن مرۆڤ ل دووڤ وان هەڤسەرێ ژیانا خوە هلدبژێرت، گەلەك گرنگن، و ئیسلام د ڤی واریدا ڕێکا دورست نیشا مە ددەت، و گەلەك پیڤکان دکەتە د دەست مەدا، دا ئەم ب سەردا نەچین و ل سەر بنستر و بناخەیەکا دورست هەڤسەرێ خوە هلبژێرین، و نەخشەیەکی دورست بۆ بنەمالەکا بەختەوەر دابرێژین.

## بناخه و پیڤکێن هلبژارتنا هەڤسەری د دیتنا ئیسلامێدا:

### ئ - بەرچاڤوەرگرتنا ئایینێ:

ئیسلام گەلەك گرنگییێ ددەتە هندێ کو خێزان ل سەر بنستر و بناخەیەکا موکوم بێتە ئاڤاکرن، چونکی ئەگەر بنستر و بناخەیا وێ قاهیم نەبت، نەشێت خوە ل بەر ڕەشەبایێ ئیشك و گرفتاری و گەفێن دەرەکی بگرت و ئەندامێن خوە بپارێزت، و هەر ژ بەر هندێ ژی ئایینێ دکەتە بناخە و بنسترەکا موکوم و ب هێز ژ دورستکرن و پێکئینانا خوە، و پەیمانا هەڤسەرییێ ژی د ناڤبەرا ژن و مێراندا ب تشتەکی پیرۆز دبینت.

بەرچاڤوەرگرتنا بها و بنسترێن ئیسلامێ د ژیانا بنەمالێدا، هەڤسەران دوور دئێخت ژ خیانەتکرنێ و وان هانددەت کو پێکڤە هەڤکاربن بۆ دەربازکرنا ژین و ژیارەکا خوەش و پەروەردەکرنەکا جوان بۆ زارۆکێن خوە و پارزتنا تەناهییا بنەمالێن خوە.

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د ڤی واریدا دبێژت: ((تنكح المرأة لأربع، لمالها ولحسبها ولجمالها ولدينها، فاظفر بذات الدين تربت يداك))، ئانکو ژن ژ بەر چار ئەگەران دئێتە مارکرن: ژ بەر دەولەمەندی و مالێ وێ، یان بنەمالا وێ، یان جوانییا وێ، یان ژی دینداریيا وێ، تو دینداریێ هلبژێرە.

ئەڤەژی هندێ ناگەهینت کو زەلام ژنێ نەئینت ئەگەر دەولەمەند بت یان خودانمال و جوان بت. بەلکو مەرەم ژێ ئەوە کەسێ خوە ب موسلمان بهەژمێرت، دڤێت هەردەم ئێك ژ پیڤکێن گرنگێن وی، دینداریيا هەڤسەرا وی بت، چونکی وەکی پێشتر مە گۆتی، بەرچاڤوەرگرتنا بهایێن ئیسلامی و پێگیرییا هەڤسەر و ئەندامێن بنەمالێ ب وان ئەرکێن موسلمانەتییێ ئەوێن ل سەر ملێن وان، بنەمالێ موکوم و ب هێز دئێخت و ئیشك و گرفتارییێن بنەمالێ کێم دکەت، و هاریکارەکی باشە بۆ جهئینان و ب دەستڤەئینانا سەقایەکی بەختەوەر و تژی هەست و نەست نازك د بنەمایدا.

### ب- ڕەوشتجوانی:

پیڤکەکی دی یێ هلبژارتنا هەڤسەری، هەبوونا ڕەوشتێ جوانە د دەستنیشانکرن و هلبژارتنا هەڤسەرێ یان هەڤسەرا پاشەڕۆژێدا، بەرچاڤوەرگرتنا ڕەوشتجوانییێ د هلبژارتنا هەڤسەرێ کچ و کوڕاندا، گەلەك گرنگە، نەمازە بەرچاڤوەرگرتنا ڕەوشتجوانییێ ل دەڤ زەلامی، چونکی ئەگەرێ مان و نەمانا بنەمالێ، ئەوێ پەروەردەکرنا ساخلەم و ڤەهەسیان، یان تێکدان و نەخوەشی پێڤە

گرێدایی، هەبوون و نەبوونا ڕەوشتانە ل دەڤ هەڤسەر و ئەندامێن بنەمالێ، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د ڤێ واریدا و د فەرمۆدەیەکێدا بنەمالان شیرەت دکت و دبێژت: ((إذا جاءكم من ترضون دينه و خلقه فزوجوه، الا تفعلوه تكن فتنة في الارض و فساد كبير)). (ترمذی و حاکم) ڤەگوهازتییە.

ئانکو: ئەگەر ئێك هاتە کچا هەوە و هوون ژ ڕەوشت و دینێ وی ڕازی بن بدەنێ (هەلبەت پشتی ڕازیبوونا کچکێ ب خوە)، چونکی ئەگەر هوون وە نەکەن، خرابی و فتنە دێ ل سەر ڕوویێ ئەردی بەلاڤ بت. ئانکو بەری مرۆڤ بەرێ خوە بدەتە دەولەمەندی و جوانی و نیاسینی و باوەرنامە و هندەك تشتێن وەکی ڤان، ژ بۆ بەرچاڤکرنا هەڤسەرێ خوە یان یێ کوڕ و کچا خوە یان یێ خووشك و برایێ خوە، دڤێت بەرێ خوە بدەتە ڕەوشتێ کەسێ یان کەسا بەرچاڤکری و هزرا خوە تێدا بکەت. چونکی ئەگەر مرۆڤەکێ هەمی تشتێن دی هەبن، بەلێ دەهمەنپیسی ل دەڤ هەبوو، ئەها هنگێ ئەو نەشێت ببتە هەڤسەرەکی باش، چ ژن چ ژی مێر، و دێ گەلەك ئێشك و گرفتارییان بۆ هەڤپشکێ ژیانا خوە و بنەمالا خوە پەیدا کەت.

ژ ئالییەکی دی، تشتێ گرنگ د ڤێ فەرمۆدەییدا ئەوە، کو دینداری ب تنێ بەس نینە بۆ ڕازیبوونێ ب کەسەکێ کو وەك هەڤسەر بێتە هلبژارتن، بەلکو تشتێ د گەل گرنگ و پێڤە گرێدایی، ڕەوشتە. مەرج نینە ئێك پێشچاڤ موسلمان ە و ديندار بت و ڕەوشتێ وی د گەل هەڤسەرێ وی مرۆڤانە و جوان بت، کەسێ چەند موسلمان بت، بەلێ موسلمانەتییا وی، کار ل ڕەوشتێ وی نەکربت، و دلپیس و ڕەزیل و هەستبرینداركەر و بێتبعەت و زمانڕەش و تەنبەل بت، ب کێر هندێ نائێت وەك هەڤپشك و هەڤسەر بێتە هلبژارتن.

**پ- ئازادی د هلبژارتنێدا:**

چونکو ل دووڤ دیتنا ئیسلامێ، دڤێت بنەمال ل سەر بنستر و بناخەیا سۆز و ڤیانێ بێتە ئاڤاکرن، نابت زۆری ل ئێك ژ هەردو هەڤسەران بێتە کرن، و نەمازە کچێ، د دەمێ هلبژارتن و دیارکرنا هەڤسەریدا.زۆریلێکرن د دانەشوو و ژنئینانێدا، نەریتەکی پاشکەڤتی و نەفامێ عەشیرکییێ بەری ئیسلامێیە و دڤێت نەمینت و بێتە ڕاکرن، و د گەل ئیسلامێ ناگونجت. گرێبەستا هەڤسەرییێ د شەریعەتێ ئیسلامێدا، گرێبەستەکە ل سەر بناخەیا ڕازیبوونا هەردو ئالییان دورست دبت، و هەر ب وێ ڕازیبوونێ ژی ئاڤا دبت، ئەگەر زۆری ل ئالییەکێ بێتە کرن، ب هندێ گرێبەستا ژێگۆتی دورست نابت و بەتالە.

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((لا تزوج الثيب حتى تستأمر و لا تزوج البكر حتى تستأذن)) موسلم و بوخاری ڤەگوهازتییە.

ڤەگوهازتییە دبێژت: کچەکا گەنج هاتە دەڤ پێغەمبەری و گۆتیێ کو بابێ وێ بێ ڕازیبوونا وێ داییە شوو، و ئەو حەز ناکەت شوو ب وی کەسی بکەت، ئەوێ بابێ وێ بۆ هلبژارتی، ئینا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) مافێ هلوەشاندنا گرێبەستێ و ڕازیبوونێ هلپەسارتێ، و سەربەستکر د هلبژارتنا ئێك ژ هەردویاندا.

ئەبوو هورەیرە ژی ڤەدگوهێزت، دبێژت کو کچەك هاتە دەڤ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) و گۆتیێ: بابێ من بێ رازیبوونا من، ئەزا داییمە برازاییێ خوە، دا شانێ خوە پێ بلند بکەت. ئینا پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆتیێ بڕیار بڕیارا تەیە، تو دشێی هلوەشینی، ئینا کچکێ گۆت: من ڕێ دا بابێ خوە و ئەز ڕازیمە ب کریارا وی، بەلێ من ڤیا ژن بزانن کو بابێن وان، ماف نینە بێ ڕازیبوونا وان، وان ب زۆری بدەنە شوو.

دڤێت دەیك و باب د ڤی واریدا و د ڤێ مەسەلەیا هەستیارا گرنگدا، ب دلسۆزی سەرەدەرییێ بکەن و ئازادییێ بدەنە کوڕ و کچێن خوە، و د هەمان دەمدا ژی، وان ڕاستەڕێ بکەن، و بەرێ وان بدەنە باشترین ئاواییێ هلبژارتنا هەڤسەرێ وان، دا ل سەر بنسترەکا ڕووکێشکری و سەرڤەسەرڤەیا سادە و ساکار و د بن کارلێکرنا سۆزەکا گەنجانەیا ڕووتدا، هەڤسەرێ ژیانا خوە هلنەبژێرن، چونکی پێکئینانا بنەمالێ بەرپسیارییە و دڤێت ژ ئالییێ جڤاکی و دەروونی و فسیۆلۆجیڤە ئاڤاکری و موکوم بت و ببتە هێلینا بەختەوەری و پەروەردەیا باش، ژ بۆ جڤاك ژی ب هێز و چەلەنگ و وەرارکری بت. کوڕ و کچ ژی، پێدڤییە مشێورا خوە ب دەیك و بابان بکەن و مفایی ژ شیرەت و شارەزاییا وان وەربگرن.

### ت- بەرێخوەدان و ناسین و د ئێکدوگەهشتن:

ئەو دو کەسێن دڤێن ببنە هەڤسەرێن ئێکدو، دڤێت ئێکدو ببینن و ژ ئێکا دیمەن و مەسەلەیێن دیڤە، ب دلێ ئێکدو بن، ژ نوو بزاڤێ بۆ هەڤسەرگیرییێ بکەن و پێگاڤان بۆ باڤێژن.

ڕۆژەکێ ئێك ژ هەڤال و هۆگرێن پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) داخوازا کچەکێ کربوو، پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆتیێ: تە کچك دیتییە و ب دلێ تەیە؟ گۆت: نەخێر، ئینا گۆت: دێ هەڕە ببینە، چونکی ئەڤە پێدڤییە ژ بۆ کو هەڤبەندییا هەڤسەرییا هەوە د گەل ئێکدو بەردەوام ببت، ناسین و د گەل ئێك ئاخڤتن و پێکگوهارتنا بیر و ڕایان د گەل هەڤدو، ئەڤە هەمی، ئەگەر مەرەم ژێ هەڤسەرگیری بت و ژ چارچۆڤێ پیڤك و ڕەوشتێن ئیسلامی دەرنەکەڤن، دێ خزمەتا پرۆسەیێ

هەڤسەرگیرییێ کەن، دا پێکئینانا بنەمالێ ل سەر بناخەیێ ڕازیبوون و د ئێکدوگەهشتنێدا بت، نە ل سەر بنسترا سۆز و دیتنا سەرڤەسەرڤە بێتە ئاڤاکرن، و مەرەم ژێ نە تنێ تێرکرنا غەریزەیا جنسی بت، بەلکو جهئینان و پەیداکرنا ژین و ژیارەکا تەنا و تژی خێر و خوەشی و سۆز و هاریکاری. بەلێ چونکو بەری هەر تشتەکێ، ئیسلام وەك مرۆڤ بەرێ خوە ددەتە ژنێ، نابت ئەولەیی بۆ مەسەلەیا جوانییێ بێتە ئێخستن و هەر تشتەك د جوانییا وێدا بێتە کورتکرن.

**ج- هەڤپاکی:**

ئانکو هەردو هەڤسەر د هندەك ئالییاندا نێزیکی ئێکدوبن و هندەك جودایی نەبنە ئەگەرێ پەیداکرنا نەلێکییا بنەمالێ و کێمکرنا هەستکرنێ ب سۆز و بەختەوەرییێ د ناڤبەرا واندا، ئاشکەرایە ژی کو د ئیسلامێدا چینایەتی نینە و مرۆڤ بەرانبەری خودێ و یاسایا ئیسلامێ یەکسانن، بەلێ د هەمان دەمیدا، بەرچاڤوەرگرتنا هەڤکووفییێ ل دووڤ دەم و سەردەم و جهێن جودا بۆ پێکئینانا بنەمالێ گرنگە، هەڤکووفی ژی پتر زەلامی دگرت، نە ژنێ.

ئانکو هەر ژنەك، ئاستێ وێ چاوابت، هەڤکووفا هەر زەلامەکێیە، خوە پێك و پایەیا زەلامی چەند بلند ژی بت، مەخسەد ژ بەرچاڤوەرگرتنا ڤێ خالێ ئەوە، دا مرۆڤ ژ بۆ بنەمالەکا تەنا و تەسەل پێکبینت، بزاڤێ بکەت، ئاستێ جڤاکی و ڕەوشەنبیری و ئابۆرییێ وێ بنەمالێ، ئەوا خزمانییێ د گەل دکەت، بەرچاڤ وەربگرت و دا جودایی د ناڤبەرا هەردو بنەمالاندا گەلەك نەبت، و دا هەڤگوری و گونجانەکا باش د ناڤبەرا هەردو ئالییاندا هەبت.

### دان و ستاندن:

لاوازبوونا بنەمالێ چ ڕەنگڤەدانا خراب ل سەر ژیانا ئەندامان و جڤاکێ هەیە؟

### ڤەکۆلان:

دەورێ خۆرت و لاوان د بەختەوەرکرنا بنەمالا واندا چیە؟

### پسیار:

١- ئەرێ زۆریکرن ل کوڕ و کچان، د مەسەلەیا ژنئینان و شووکرنێدا، د گەل ئیسلامێ گونجاییە؟

٢- دڤێت ئەم ل سەر چ بنستر و بناخەیێ هەڤسەرێ ژیانا خوە یا پاشەڕۆژێ هلبژێرین؟

# گرنگییا بنەمالێ و ئەرکێن وێ د ئیسلامێدا

ئاشکەرایە، ئیسلام پووتەیەکی ئێکجار مەزن ددەتە بنەمالێ، و ژ بەر هندێ، رێ و نیشادانێن خوەیێن تایبەت هەنە، هەر د سەرێ پێکهاتنا بنەمالێدا، هەتا دگەهتە رێك و پێككرن و ب سەروبەرکرنا هەڤبەندییان د ناڤبەرا ئەندامێن وێدا.

د دیتنا ئیسلامێدا، ئەو بنەمالا خودایێ مەزن بپەرێست و پیڤکێن ئیسلامی، ژ بۆ بەختەوەرییا ئەندامان، ل سەر بێنە چەسپاندن، دڤێت گەلەك ئەرکان ب جھ بینت، پووتە و ئەرکێن بنەمالێ ژی ل گۆر دیتنا ئیسلامێ، د ڤان خالێن خوارێدا دیار دبن:

**ئێک- دابینکرنا تەناهی و خوەشییێ:** ئەرکێ بنەمالێ یێ ئێکێ، ل گۆر دیتنا ئیسلامێ ئەوە کو ببتە ئاخ و کاخ و جھەك بۆ خوەشییا دەروونییا دەیباب و زارۆکان، خودایێ مەزن دبێژت: ((**وَاللّهُ جَعَلَ لَكُم مِّن بُيُوتِكُمْ سَكَناً**)) (النحل ٨٠)، ئانکو: خودایێ مەزن مالێن هەوە کرینە ژێدەرێ تەناهی و خوەشییێ، تشتێ ژیان و تەناهی و ئاشتی و خوەشییێ ددەتە مالێ بنەمالە.

خودایێ مەزن کا چاوا مالێن مە بۆ مە کرینە جھێ ڤەحەویانێ، ئەها وەسا هەڤبەندییا هەڤسەرگیرییێ، کرییە ژێدەرێ تەناهییا دلی و خوەشییا دەروونی، هەروەکی ئەو ب خوە دبێژت: ((**وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُم مِّنْ أَنفُسِكُمْ أَزْوَاجاً لِّتَسْكُنُوا إِلَيْهَا...**)) (الروم ٢١). ئانکو: ئێك ژ نیشانێن خودایێ مەزن ئەوە کو مرۆڤ ژ دو رەگەزان چێکرییە، دا ب رێکا پێکئینانا بنەمالێ و گرێدانا هەڤبەندییا هەڤسەرگیرییێ د گەل ئێکدو، هەر ئێك ببتە ژێدەر و سەرەکانییا تەناهی و بەختەوەرییێ بۆ یێ دی، هەر وەکی خودایێ مەزن دبێژت: ((**هُوَ الَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَاحِدَةٍ وَجَعَلَ مِنْهَا زَوْجَهَا لِيَسْكُنَ إِلَيْهَا...**)) (الأعراف ١٨٩). ئانکو خودایێ مەزن ئەوە ئەوێ هوون ژ ئێك توخمی دورستکرین، هەر ژ وی توخمێ، هەڤسەر ژی بۆ چێکر، دا د بن سیبەرا ئێکدودا تەنا بژین.

ئەڤ خوەشی و تەناهییە ژی، ب هندێ دئێتە جھئینان، گاڤا ئەندامێن بنەمالێ ژ ئێکدو پشتراست بن، و وان هەمی تشتێن دبنە ژێدەرێ نەلێکی و کەرب و کینێ بدەنە رەخەکێ، و پێکۆلێ بکەن، سەقایەکی تژی خوەشی و تەناهی و بەختەوەری بۆ خێزانا خوە پەیدا بکەن.

د دیتنا ئیسلامێدا ژن و مێر ئێکدو تەمام دکەن، کەس ژ وان بێ یێ دی تەناهییا دورست ب دەست خوەڤە نائینت، مرۆڤ هندی بنەمالێ پێك نەئینت، هەست ب کێماسی و ڤالاتییا دەروونی و جڤاکی دکەت، ب کارێ ڤێ هەڤبەندییا باش، ئەوا د ناڤبەرا ژن و مێراندا، مال وەرارێ دکەن و جڤاك ژی پێش دکەڤت.

هەڤبەندییا ژن و مێران د بنەمالێدا، دڤێت بگەهتە ئاستەکی وەسا کو هەردو وەکی گیانەکێ لێ بێن، هەست و ئارمانج و خەمێن هەڤپشك هەبن، و هەر ئێك ژ وان حەز و بەختەوەری و کەساتی و خوەشییا یێ دی بەرچاڤ وەربگرت: ((...**هُنَّ لِبَاسٌ لَّكُمْ وَأَنتُمْ لِبَاسٌ لَّهُنَّ**...)) (البقرة ١٨٧).

ئانکو: ژنێن هەوە بۆ هەوە کراسن و هوون ژی بۆ وان کراسن، کراس و جلك مرۆڤی ژ گەرمێ و سارمایێ (سەرمایێ) و نەخوەشییێ دپارێزت و جوانییێ دسپێرتە لەشێ مرۆڤی، هەڤسەر ژی دڤێت رۆلێ کراسی بۆ ئێکدو ببینن و ببنە ژێدەرێ دلخوەشییا ئێکدو و هەڤدو جوان بکەن، ئەڤەژی هندێ دگەهینت کو بنەمال نە جهێ ململانێ و ستوچەماندن و نواندنا هێز و دەستهلات و خوەراکێشان و پشتتێکرنێیە، بەلکو کۆش و همبێزا رەوشت و وەفا و ڤیانێیە.

**دو- دابینکرنا سۆز و دلۆڤانییێ:** ئەرکەکی بنیاتییێ دی یێ بنەمالێ، بەردەستکرنا سۆز و ڤیانێیە بۆ ئەندامان. تشتێ دبتە هێڤێنێ ژیانەکا بەختەوەر بۆ بنەمالێ، هەستکرنە ب گەرمییا وێ سۆز و دلۆڤانییێ، ئەوا بنەمال ددەتە مرۆڤی و چو دەزگەهێن دی پێ چێنابت وەکی بنەمالێ ڤی رۆلی ئەنجام بدەن. مرۆڤ دەمێ د ژیانێدا هەست ب وەستیانێ دکەت یان دوەستت، پێدڤی ڤەهەسیان و بێنڤەدانێ دبت، ژ بەر هندێ دەمێ ڤەدگەرتە ناڤ بنەمالێ، مافێ وییە هەست ب ڤیانەکا پاك و گیانەکی تژی دلۆڤانی بکەت. دڤێت دەیك و باب و زارۆك ژی تێکدا هاریکارییا ئێکدو بکەن، دا بنەمالا وان تژی بت ژ ڤیان و هەستێ نازك و سۆز و دلۆڤانییا پاقژ، خودایێ مەزن د ڤی واریدا دبێژت: ((...**وَجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ**)) (الروم ٢١).

ئانكو: خودايێ مەزن سۆز و دلۆڤانی د ناڤبەرا هەوەدا - د ناڤبەرا ژن و مێراندا وەك دو هەڤسەر- دورست كرییە، ئەڤەژی بەلگە و نیشانن بۆ وان كەسێن هزرێن خوە دكەن. د دیتنا ڤێ ئایەتێدا، ئەو بنەمال ب بنەمال دئێتە دانان، و خودایێ مەزن ژێ ڕازییە، و ل سەر بناخە و بنسترا ئیسلامێ هاتییە ئاڤاكرن، ئەوا كۆش و همبێزا سۆز و ڤیانێ بت، ژن و مێر و سەرانسەری ئەندامێن وێ، د گەل ئێكدو دلۆڤان بن و ئێكدو بڤێن و دووربن ژ توند و تیژی و وان نەلێكی و ئارێشەیێن كو تەناهی و بەختەوەرییا بنەمالێ تێك ددەن و پووچ دكەن.

هەر بنەمالەكا ستەم تێدا ل ژنێ بێتە كرن و توند و تیژی د گەل وێ و زارۆكان بێتە كرن ژ بەرێ زەلامیڤە، یان ژی زەلام تێدا زڕباربت ژ سۆز و هەستێ پاك و نازكێ ژنێ، ئەو بنەمال ژ رێ و نیشانێن ئیسلامێ دوورە و ژیانا ئەندامێن وێ تەحل و تارییە و ژ فەرمانێن خودایێ مەزن دەركەڤتییە، چونكی هەر كەسەكێ - ژ هەڤسەر و زارۆكان - كارەكێ بكەت كو تەناهییا بنەمالێ تێك بدەت، ئەو ب ڤی كارێ خوە، دژی داخواز و فەرمانا پەروەردگاری ڕاوەستایییە و ڕێز ل مافێ ئەندامێن دی یێن بنەمالا خوە نەگرتییە، چونكی پێدڤییە ئەندامێن بنەمالێ ئەركێن ل سەر ملێ خوە بەرانبەری ئێكدو ب جهـ بینن، و ڕێزێ ل مافێ ئێكدو بگرن و هەمی هەست ب ڕێز و ڕوومەت و كەرامەتا خوە بكەن.

**سێ- پەروەردەكرنا زارۆكی:** ئارمانج ژ دورستكرن و پێكئینانا بنەمالێ، چێكرنا دووندەهـ و بەرەبابەكی باش و ڕەوشتپاكە، دا تاك ب تەناهی پێكڤە بژین، و ڕێزێ ل ئێكدو بگرن، و هەر ژ بەر هندێ، ئێك ژ گرنگترین ئەركێن بنەمالێ، پەروەردەكرنا زارۆكییە ژ بەرێ دەیك و بابانڤە، و دیارە ژی كو ئێك ژ ئارمانجێن هەڤسەرگیرییێ، ڕانانا دووندەهێیە ژ بۆ بەردەوامبوونا ژیانێ و ڕەگەزێ مرۆڤی ل سەر ڕوویێ ئەردی، لێ بەلێ ئەركێ دەیك و بابان ل ڕانانا زارۆكان و خودانكرنا وان ب دووماهی نائێت، بەلكو ئەڤە هەمی بێ پەروەردەكرنەكا ڕاست و دورستا زارۆكی، ئارمانجا دورستا بنەمالێ ب جهـ نائینت و ناهنگێڤت. د دیتنا ئیسلامێدا، دڤێت بنەمال ببتە قوتابخانەیەك بۆ بەرهەڤكرنا بابكەكی باوەردار و هشیار و خێرخواز، و قورئان دەیك و بابان فێر دكەت كو زارۆكێن خوە ب ئاوایەكی وەسا پەروەردە بكەن، پێ ب چاڤ و گاڤ بكەڤن و بەرێ وان بكەڤتە خودێناسی و قەنجیكاری و خزمەتكرنا جڤاكێ، هەر وەكی قورئانێ دیاركری: ((وَالَّذِينَ يَقُولُونَ رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَاماً)) (الفرقان ٧٤).

ئانكو: ئەوێن دوعا دکەن و دبێژن خودێوۆ بنەمال و دووندەهەکا وەسا بدە مە کو ببنە بیناهییا چاڤێن مە، و مە بکە ڕێبەر و سەرکێش بۆ خوەشمرۆڤان.

ئانکو بنەمالیێ د ئیسلامێدا پێکەکا پیرۆز هەیە و سەخمەراتی کۆمەکا ئارمانجێن بلند و پیرۆز هاتییە دورستکرن، و هەر ژ بەر هندێ، ئیسلام داخوازێ ژ موسلمانی ژی دکەت کو ب گرنگی بەرێ خوە بدەتێ و ب ڤێ ڕێکێ ژی، ئەو ب خوە بەختەوەربن و خزمەتا جڤاکا خوەژی بکەن و ڕێکێ ل لاوازی و هلوەشیانا بنەمالیێ بگرن و سنگێ وان هەمی بانگ و گازییێن نەڕاست بگرن، ئەوێن پێك و پایەیا بنەمالیێ کێم دکەن و بێڕێزییێ د ڕاستا سنج و بهایێن وێدا دیار دکەن، یان داخوازا هەڕافتن و هلوەشاندنا وێ دکەن، چونکی لاوازی و فرفۆتبوونا بنەمالان، گەلەك نەخوەشی و گرفتارییێن جڤاکی ب دووڤەنە، ژ وان:

١- زارۆك بەدەدە (متشرد) دبت و بەرهنگاری کۆمەکا دیاردەیێن ب ترس وەکی مادەیێن نەهشکەر و ڤەخوارنێ دبت و ژ بەرێ هندەك دەستەکێن مافیاڤە، بۆ کارێن ب ترس و بەدڕەوشت دئێنە کارئینان.

٢- نەمانا ڤیانا دورست و ڕاستانی د ناڤبەرا ژن و مێراندا ب ئاوایەکی وەسا کو بشێن ژیانەکا دۆمدرێژ پێکڤە دەرباز بکەن.

٣- زاڤبوونا (زەحفبوونا) نەخوەشییێن دەروونی و هەستکرن ب تنێیاتی و خودووك (قلق) و ترسێ.

٤- لاوازبوونا هەڤبەندییێن جڤاکی، کو ئەڤەژی گیانێ هاریکارییێ کێم دکەت و وە ل تاکان دکەت کو هەست ب تنێیاتی بکەن و نەشێن ل دووڤ پێدڤی و هەوجەییێ، تامێ ژ ژیانێ وەربگرن.

ژ بۆ کو ئەم ڕێکێ ل ڤێ چەندێ بگرین و بنەمالێن مە ببنە جهەك بۆ پەروەردە و ڤەهەسیان و وەرارکرنا ئەقل و هزر و سۆز و ڤیانێ، پێدڤییە هەمی تشتێن پێشتر هاتینە بەحسکرن، بەرچاڤ بێنە وەرگرتن.

ئەرکێ خۆرت و لاوان ژی د ڤی واریدا گرنگە، و دڤێت ڕەفتارێ وان ب ئاوایەکی وەسا بت، کو د گەل ئارمانجێن بنەمالەکا موسلمان و هەڤچەرخدا گونجایی بت. هەر کار و ڕەوشت و ڕەفتارەکێ ببتە ئەگەرێ تێکدانا سەقایێ تەناهییا بنەمالیێ، یان ناڤ و دەنگێ وێ لەکەدار (عەیبدار) بکەت، پێدڤییە ژێ دوور بکەڤن، دا هاریکارییا دەیك و باب و بنەمالێن خوە بکەن، و پێکۆلێ بکەن بنەمالێن خوە بکەنە بنەمالێن نموونەیی و بژارە، ئەو بنەمالا ژ شەڕ و قەرقەشە و گرفتارییان ڤالا و د بن سیبەرا تەناهی و ڤیانێدا و ئەندامێن وێ د گەل ئێکدو دێم ڤەکری و دەڤ ب کەن و خودانڕێز و

ب زمانەکی خوەش ئێکدو دئاخێڤن، هەروەسا ڕێزێ ل بیر و بۆچوونێن ئێکدو دگرن و هاریکارییا ئێکدو دکەن.

## ئەرک و مافێن ئەندامێن بنەمالێ د دیتنا ئیسلامێدا

دا کو بنەمال بەردەوام ببت و ڕۆلێ خوە یێ دەروونی و جڤاکی و پەروەردەیی ب ڕەنگێ پێشتر هاتییە بەحسکرن ببینت، ئیسلامێ پێکۆل کرییە، ئەرك و مافێن ئەندامێن وێ دەستنیشان بکەت. و چونکو بنەمال ژ دەیك و باب و زاڕۆکان پێك دئێت، دڤێت ئەرك و ماف هەمییان ڤەگرن و ژ هەمییان بگرن. و ژ ئەرکێ موسلمانانە و ڕەوشتانەیێ هەر تاکەکی بنەمالێیە، ئەرکێن سەر ملێ خوە ب جوانی بەرانبەر ئەندامێن دی یێن بنەمالا خوە ئەنجام بدەت و ڕێزێ ل مافێن وان بگرت، و ژ مافێن خوە ب خوەژی بێبار نەبت. بۆ باشتر ڕۆنکرنا ڤان ماف و ئەرکان، ل ئێرە ئەم دێ پێکۆلێ کەین ب کورتی بەحس ژێ بکەین و بدەینە بەر چاڤێن قوتابییێن خوە یێن خوەشڤی:
**ئێک – مافێن ژن و مێران بەرانبەری ئێکدو:** د ئیسلامێدا ژن و مێران گەلەك ماف ل سەر ئێکدو هەنە، و نابت کەس ژ وان مافێ شەرعی و یاساییێ هەڤسەرێ خوە بنپێ بکەت، چونکی بەرچاڤوەرنەگرتنا مافان دێ بتە ئەگەرێ تێکچوونا هەڤبەندییان و کێمبوونا تەناهی و ڤیانێ د بنەمالاندا، مافێ هەر هەڤسەرەکێ ژی ل سەر یێ دی، ئەرکە ل سەر یێ بەرانبەر. د ئیسلامێدا دڤێت ب ڤیان و دلۆڤانی و ڕێزگرتن، سەرەدەرییێ د گەل ئێکدو بکەن و ژ زڤری و توند و تیژی و بەرچاڤوەرنەگرتنا مافێن ئێکدو دووربن.

### دان و ستاندن:

ل دووڤ وان ئەرکێن بنەمالێ ئەوێن هاتینە بەحسکرن، بەحسێ هندەك ژ گرفتارییێن مە یێن نهۆ بکە.

### هزرکرن:

بنەمالا بەختەوەر ل سەر چ بناخە و بنسترێ دورست دبت؟
ڕۆلێ بنەمالێ د بەختەوەرکرنا خۆرت و لاواندا چیە؟

## دوو – مافێن زارۆکی د بنەمالێدا

# مافێ زارۆکی ل سەر دەیک و بابان

***زارۆکی د ئیسلامێدا ژ دەرڤە و ناڤدەیی بنەمالێ گەلەک ماف هەنە***

***دەیک و باب دڤێت ڤان مافێن زارۆکی بەرچاڤ وەربگرن و بنپێ نەکەن***

**ژ گرنگترین وان مافان ژی ئەڤێن خوارێنە:**

**١– ئاهەنگگێڕان ب هلکەڤتنا بوونا وی:** د ئیسلامێدا دڤێت بنەمال و دەیباب ب ئاهەنگ و خوەشی پێشوازیيا بوونا زارۆکی بکەن و ب ئێك ژ نیشانێن خێر و خوەشییێ ببینن. و د ڤێ چەندێ ژیدا دڤێت جودایی د ناڤبەرا کوڕ و کچاندا نەبت، دەربڕینا خوەشییێ ب هلکەڤتنا بوونا کوڕی و دلنەخوەشبوون ب بوونا کچێ - کو مخابن هەتا نهۆ ژی شوونماییێن وێ دئێنە دیتن - پشکەکە ژ ڕەوشتێ نەفامێ بەری ئیسلامێ و خودایێ مەزن د قورئانێدا ب دژواری ڤێ بیر و هزر و سەرەدەرییا نەئیسلامی لەکەدار دکەت و دبێژت: ((وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُمْ بِالأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدّاً وَهُوَ كَظِيمٌ ﴿٥٨﴾ يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلاَ سَاء مَا يَحْكُمُونَ ﴿٥٩﴾)) (النحل ٥٨ – ٥٩)، ئانکو دەمێ مزگینییا کچێ دگەهتە ئێك ژ وان، سەر و چاڤ لێ تێك دچن و ڕەشڤە دبن و کەربگرتی و خەمگین دبت، ژ بەر نەخوەشییا مزگینییا گەهشتییێ، هزرێن خوە دکەت، کا بهێلت کو ببتە ژێدەرێ سەرشۆرییێ یان ژی ب ساخی بنئاخ بکەت؟ ب ڕاستی دادوەرییەکا خرابە و حوکمەکی نە د ڕێدایە. ئەڤ وێنەیێ قورئان بۆ مە بەرچاڤ دکەت، وێنەیێ کەسەکی نەفام و پاشکەڤتییە ژ سەردەمێ نەفامییا عەرەبان.

د ئیسلامێدا کوڕ و کچ هەردو مرۆڤن، و هەردوکان کەرامەتا خوە هەیە و مرۆڤانییا کەس ژ وان ژ یا ییێ دی پتر نینە. ئیسلامێ هەر ژ ڕێڤە و سەخمەراتی کێمکرنا ڤی نەریتێ پاشکەڤتییێ کەڤن، ئەڤێ د وەختێ خوەدا، ڕێز و بهاییێ ژنێ کێم دکر و ڕوییێ خوە ل بوونا وێ ڤەنەدکر و خێرهاتن پێ نەدکر، بزاڤ کرییە، ڤان دیاردەیان نەهێلت و باوەرداریيا موسلمانان بەرخزمەت بکەت ژ بۆ هنگاڤتنا ڤێ ئارمانجێ، و وەك ڕێخوەشکرن بۆ ئەنجامدانا ڤێ مەرەما پیرۆز، خودانی و دلۆڤانی د گەل کچێ و خووشکێ کرە قەنجییەکا مەزن و ئێك ژ ئەگەرێن چوونا بەهەشتێ، دا ب ڤێ ڕێکێ موسلمانان هان بدەت کو ب دلخوەشییەکا زێدە، پێشوازییا بوونا کچان بکەن. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د ڤی واریدا دبێژت: ((**من عال جارية، دخلت أنا وهو الجنة كهاتين وأشار باصبعيه**)). هەروەسا گۆتییە: ((**من كن له ثلاث بنات أو ثلاث أخوات فاتقى الله وأقام عليهن كان معى فى الجنة – وأومأ بالسبابة والوسطى**)) (موسلم و ترمذی ڤەگوهازتییە). ئانكو: هەر كەسەكێ سێ كچ هەبن، ب خەم سەرەگوهی و خودانییێ ژێ بكەت، ژین و ژیارێ بۆ وان بەردەست بكەت، سەخمەراتی وان دێ چتە بەهەشتێ، و د فەرمۆدەیەكا دیدا هاتییە، مە گۆت: دو ژی هەبن، گۆت: ئەرێ دو ژی، مە گۆت: ئێك ژی، گۆت: ئێك ژی.

هێژایی گۆتنێیە، پێغەمبەرێ مەزنێ ئیسلامێ (سلاڤ لێ بن)، دووندەها وی تنێ كچ بوون و ڕێز و قەدرەكی گەلەك مەزن ددا كچا خوە فاتیماییێ، هەر دەمەكێ ب سەرەدان دهاتە مالبابا خوە، پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) ب بەرڤە ڕادبوو، و سەرملێ (عەباییێ) خوە كو گەلەك ل دەڤ ب قەدربوو، بۆ ڕادئێخست، و ئەنییا وێ ماچ دكر و دگۆت: ((**فاطمة بضعة منی، فمن أغضبها فقد أغضبنی**)). ئانكو: فاتیما پرتەكە ژ جەرگێ من، هەر كەسەكێ وێ بئێشینت، ئەو من دئێشینت.

**٢– ناڤلێكرن و هلبژارتنا ناڤێ خوەش:** ئێك ژ ڕێ و ڕەسمێن بوونا زاڕۆكی د ئیسلامێدا، ناڤلێنانە، دەیك و باب ل گۆر شیان و پێچێبوونا خوە، دڤێت سەرەكێ كو دبێژنێ (عەقیقە) بۆ زاڕۆكێن خوە بدەن، و د ڕۆژا حەفتێ یان یا چاردێدا ژ بوونا زاڕۆكی، دڤێت گازی دۆست و نیاسێن خوە بكەن و د گوهێ زاڕۆكێ خوەدا بانگ بدەن و ناڤەكێ لێ بكەن، پێدڤییە ئەو ناڤێ ل زاڕۆكی دئێتە كرن

خوەش بت، و دەمێ ئەو زارۆکە مەزن دبت، ژێ شەرم نەکەت و پێ هەست ب کێماسییێ نەکەت.
**٣- ڤیان و دلۆڤانی:** پێدڤییە دەیك و بابان زارۆکێ خوە گەلەك بڤێت، و ب نەرمی و دلۆڤانی سەرەدەرییێ د گەل بکەن و ژ مافێ زارۆکییە ژ حەزژێکرن و ڤیانا وان دەیك و بابان بێ بار نەبت. هەستکرنا زارۆکی ب ڤیان و دلۆڤانییا دەیك و بابان، ڕۆلەکی گرنگ د هندێدا هەیە، کو زارۆك هەست ب تەناهی و خوەشییێ بکەت و ب ئاوایەکی ڕاست و دورست پەروەردە ببت و ژ ڕێدەرکەڤتن و نەتەناهییا دەروونی بێتە پارزتن. زارۆك دیارییا خودێیە و دڤێت بیناهی و ڕۆناهییا چاڤێن دەیك و بابان ژی بت. مخابن ژ بەر نەشارەزاییێ د ئیسلامێدا و ژ بەر هندەك نەریتێن پاشکەڤتییێن جڤاکی، هندەك باب خوەش زارۆکێن خوە، نەمازە کچان، همبێز ناکن و نادەنە بەر سینگێ خوە و ڤیانا خوە بۆ وان دەرەهی ناکەن. هەر چەندە پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ئەڤە وەك نیشانا دلرەقی و لاوازییا باوەرێ داناییە، و ئەو ب خوەژی د ژیانا خوەدا ب دورستی بەروڤاژی هندێ بوو، پێغەمبەر ژ بلی زارۆکێن خوە ب خوە، د گەل نەڤییێن خوە و زارۆکێن دی ژی، گەلەك نەرم و دلۆڤان بوو، و یاری د گەل وان دکرن و ئاخڤتنێن خوەش بۆ وان دکرن، (حەسەن و حسێن) نەڤییێن وی، ل سەر نڤێژێ د چوونە سەر ملێن وی و یاری پێ دکرن، ئەوی ژی ژ بەر هندێ دا دلێ وان نەشکێت، و یارییا وان تێك نەچت، هەتا ئەو ب خوە ژ سەر ملێن وی نەهاتبانە خوار، سەرێ خوە ژ سوجدەیێ ڕانەدکر، هندەك جاران ل چوون و ڕابوونا سوجدەیێ، زارۆك ل سەر ملان بوون، د گەل خوە ڕادکرن و ددانان. ڕۆژەکێ ئێك ژ هەڤال و هۆگرێن وی، ئەو د ڕەوشەکا وەکی ڤێدا دیت، ئینا گۆتێ: من هەتا نهۆ زارۆکەکی خوە ماچ نەکرییە و همبێز نەکرییە، پێغەمبەری ژی (سلاڤ لێ بن) گۆتێ و تێگەهاند کو ئەڤە نیشانا دلڕەقییێیە، و زەحمەتە باوەر و دلڕەقی ژی، پێکڤە د دلەکێدا کۆم ببن. ڤیان و دلۆڤانی ژی، بەروڤاژی شکاندن و سەرەدەرییا خراب و توند و تیژییێیە، و هەر ژ بەر هندێ، پێدڤییە دەیباب ڕێزێ ل بیر و بۆچوونێن زارۆکێن خوە بگرن و نەئێشینن و دلێن وان نەشکێنن.
**٤- دادپەروەری کرن د ناڤبەرا زارۆکاندا:** ئەرکێ دەیبابانە ب دادپەروەری سەرەدەرییێ د گەل زارۆکێن خوە بکەن و ئێکێ د سەرەگوهی و نازدارکرنێدە، ب سەر یێن دی نەئێخن. چونکی ئەڤە زیانەکا مەزن دگەهینتە پەروەردە و ڕەوشا دەروونییا زارۆکی، و پێدڤییە ئەم بزانن ژی کو د ڤی واریدا کچان ژی هەمان مافێ کوڕان هەیە و تێ هەیە زێدەتر ژی هەبت. ئیمامێ بەیهەقی ژ (ئەنەس)

ڤەدگوهێزت دبێژت: زەلامەك ل دەڤ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) یێ ڕوونشتی بوو، کوڕەکی وی یێ بچووك هاتە دەڤ و وی ژی ماچکر و کرە د کۆشا خوەدا، پشتی هنگێ کچەکا وی ژی هاتە دەڤ، ب تنێ دەستێ وێ گرت و دانا ڕەخ خوە، ئانکو نە ماچکر و نە کرە د کۆشا خوەدا، دەمێ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) ئەڤە دیتی، گۆتە کابرایی: تە دادپەروەری د ناڤبەرا واندا نەکر. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) د فەرمۆدەیەکا دیدا و هەر د ڤی واریدا دبێژت: ((**ساووا بين أولادكم في العطية ولو فضلت أحدا على أحد لفضلت النساء**)) ئانکو: ب یەکسانی دیارییان بۆ زاڕۆکێن خوە بکڕن، ئەگەر من ئێك ب سەر ئێکێ ئێخستبایە، ئەز دا کچان ب سەر کوڕان ئێخم.

ئەڤەژی هندێ دگەهینت کو ئەگەر د کڕینا دیارییێدا بارا کچێ ژ یا کوڕی زێدەتر نەبت، ب چو ڕەنگان نابت ژ یا وی کێمتر بت، چونکی ئیسلام ب ئێك چاڤی بەرێ خوە ددەتە هەردوکان، و ل سەر بنسترا ڕەگەزی جوداییێ نائێختە ناڤبەرا وان.

**٥- مافێ خواندن و فێربوونێ:** ئیسلام پووتەیەکی مەزن ددەتە خواندن و ب دەست ئێخستنا زانیارییان و داخوازا زانیاری و فێربوونێ کرییە ئێك ژ ئەرکێن سەر ملێ موسلمانان. پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((**داخوازا زانیاری و فێربوونێ ئەرکە ل سەر ملێ هەر ژن و زەلامەکی موسلمان**)).

ژ بەر هندێ ئەرکێ دەیبابانە، زاڕۆکێن خوە بدانن بەر خواندنێ و ژ بۆ بەردەوامی پێدان و تەمامکرنا وێ، هاریکارییا وان بکەن. هەر وەسا پێدڤییە بزاڤێ بکەن ژ بۆ سەقایەکی خوەش بۆ کوڕ و کچێن خوە بەردەست بکەن، دا د خواندنا خوەدا سەرکەڤتی بن و پاشەڕۆژەکا گەش و خوەش ب دەست خوەڤە بینن و خزمەتەکا بەرچاڤ پێشکێشی خوە و مللەت و وەلاتێ خوە بکەن.

### دان و ستاندن:

ئەم چاوا دێ شێین د ناڤ بنەمالێدا ب مافێن خوە شابین و ڕۆلێ مە د ڤی واریدا چیە؟

### پسیار:

د ئیسلامێدا زاڕۆکی گەلەك ماف ل سەر بنەمالا خوە هەنە، وان مافان چ کارلێکرن ل سەر پەروەردەبوونا وی هەیە؟

# ئەرکێ زارۆکی بەرانبەری دەیک و بابان

ئاشکەرایە کو دەیبابان د ئیسلامێدا پێك و پەیسکەکا مەزن هەیە، ئیسلام داخوازێ ژ مرۆڤی دکەت ب ئاوایەکی گەلەك جوان و خشکۆك سەرەدەرییێ د گەل دەیك و بابان بکەت و ئەرکێن ل سەر ملێن خوە، بەرانبەری وان دورست ئەنجام بدەت. گرنگترین ئەو ئەرکە ژی ئەڤێن خوارێنە:

١- قەنجیکرن د گەل وان ب هەمی ڕامانێن قەنجییێ، خودایێ مەزن دبێژت: ((وَاعْبُدُواْ اللّهَ وَلاَ تُشْرِكُواْ بِهِ شَيْئاً وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَالْجَارِ ذِي الْقُرْبَى وَالْجَارِ الْجُنُبِ وَالصَّاحِبِ بِالجَنبِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُمْ إِنَّ اللّهَ لاَ يُحِبُّ مَن كَانَ مُخْتَالاً فَخُوراً ﴿٣٦﴾)) (النساء : ٣٦)، ئانکو: خودێ بپەرێسن و هەڤپشکان بۆ پەیدا نەکەن، و قەنجییێ د گەل دەیبابێن خوە بکەن... ڤێ ئایەتێ، قەنجیکرن د گەل دەیبابان، ب چێنەکرنا هەڤپشکانڤە گرێدا بۆ خودێ، ئەڤەژی زێدەگرنگییا قەنجیکرنا ژێگۆتی دیار دکەت.

٢- گوهدانا فەرمانێن وان یێن باش و گوهدارییا وان: د ئیسلامێدا دڤێت د تشتێ قەنج و باشدا، زارۆك گوهدارییا دەیبابێن خوە بکەت، خودایێ مەزن، ل سەر زمانێ لوقمان دەمێ شیرەتێ ل کوڕێ خوە دکەت، دبێژت: ((وَإِذْ قَالَ لُقْمَانُ لِابْنِهِ وَهُوَ يَعِظُهُ يَا بُنَيَّ لَا تُشْرِكْ بِاللَّهِ إِنَّ الشِّرْكَ لَظُلْمٌ عَظِيمٌ ﴿١٣﴾ وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حَمَلَتْهُ أُمُّهُ وَهْناً عَلَى وَهْنٍ وَفِصَالُهُ فِي عَامَيْنِ أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ إِلَيَّ الْمَصِيرُ ﴿١٤﴾ وَإِن جَاهَدَاكَ عَلى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفاً وَاتَّبِعْ سَبِيلَ مَنْ أَنَابَ إِلَيَّ ثُمَّ إِلَيَّ مَرْجِعُكُمْ فَأُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ تَعْمَلُونَ ﴿١٥﴾)) (لقمان ١٣ — ١٥).

ئانکو: چیرۆکا لوقمان بۆ وان بێژە دەمێ کوڕێ خوە شیرەت کری و گۆتییێ: کوڕێ من چو هەڤپشکان بۆ خودێ چێنەکە، ب ڕاستی چێکرنا هەڤپشکان بۆ خودێ ستەمەکا مەزنە. و مە ئەمرێ مرۆڤان کر د گەل دەیبابێن خوە باشبن، نەخاسمە دەیکێ، ئەوا نەخوەشی و بێتاقەتی ل دووڤ نەخوەشی و بێتاقەتییێ پێڤە برین دەمێ هێژ د زکێ ویدا، و دو سالان ل سەرێك شیر داییییێ و ژ نو شیرڤەکری، و مە گۆتێ: سوپاسییا من بکە کو من تو دایی و سوپاسییا دەیبابێن خوە بکە کو تو خودانکری، و هوون هەر دێ ب بال منڤە زڤڕن. و ئەگەر دەیبابێن تەمانە ب تەڤە، و تە د بەر هندێڕا بکەن کو تو هەڤپشکەکێ ژ نەزانی بۆ من چێ بکەی، ئەها هنگێ گوهێ خوە نەدە وان،

و د دنیاییێدا ب باشی و قەنجی د گەل وان ببۆرینە، و ڕێکا وی بگرە ئەوێ بەر ل من، پاشێ هوون دێ هەر ب بال منڤە زڤڕن، ڤێجا هنگێ تشتێ هەوە کری، دێ هەوە پێ ئاگەهدارکەم.

ل ئێرە خودێ سوپاسکرنا خوە و یا دەیك و بابان داییە د گەل ئێك، ئەڤ ئایەتە ڕێکێ نیشا مە ددەن کو ئەم د تشتێ خرابدا، گوهدارییا دەیبابان نەکەین، و ژ بلی هندێ ئەم ژ گوهدارییا وان دەرنەکەڤین.

بەلێ تشتێ دڤێت ئەم بزانین ل دووڤ ڤێ ئایەتێ ئەوە کو گوهدارینەکرنا دەیك و بابان د وی تشتێ کو خودێ پێ رازی نەبت، هندێ ناگەهینت ئەم د گەل وان خراب بین و قەنجیییێ د گەل وان نەکەین، چونکی دەیك و باب چ بن و خوە چو دین ژی وان نەبن، مافێ وانە و ئەرکێ سەر ملێ مەیە ئەم قەنجیییێ د گەل وان بکەین و ڕەوشتێ مە د گەل وان جوان بت و ب جوانی سەرەدەرییێ د گەل وان بکەین.

**٣-** نەئێشاندنا دل و دەروونێ وان و دەخسیرنەکرنا وان: د ئیسلامێدا نابت زارۆك مرووتا (نەعیما) خوە ل دەیك و بابێن خوە نەخوەش بکەت و ئەنییا خوە ل وان بکەتە گرێك، نەمازە دەمێ پیر دبن و دلێ وان نازك دبت و گەلەك هەوجەیی هاریکاری و ل بەر دلدانا مە دبن. خودایێ مەزن دبێژت: ((وَقَضَى رَبُّكَ أَلاَّ تَعْبُدُواْ إِلاَّ إِيَّاهُ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَاناً إِمَّا يَبْلُغَنَّ عِندَكَ الْكِبَرَ أَحَدُهُمَا أَوْ كِلاَهُمَا فَلاَ تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلاَ تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً ﴿٢٣﴾ وَاخْفِضْ لَهُمَا جَنَاحَ الذُّلِّ مِنَ الرَّحْمَةِ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيراً ﴿٢٤﴾)) (الاسراء ٢٣ — ٢٤).

ئانکو: و خودێ فەرمان داییە کو هوون وی ب تنێ بپەرێسن و قەنجیییێ ژی د گەل دەیبابێن خوە بکەن، و ئەگەر ئێك ژ وان یان هەردو ل دەڤ تە پیربوون، تو خوە نەبێژە وان ئۆف ژی و ل وان نەخوڕە و وان پاشڤە نەبە و وان ب ئاخڤتنەکا نەرم و جوان باخێڤە، و خوە زێدە بۆ وان بشکێنە و زێدە دلۆڤانییێ د ڕاستا واندا بکە و بێژە: خودێوۆ دلۆڤانییێ ب وان ببە هەر وەکی وان ب بچووکاتی دلۆڤانی ب من بری و ئەز مەزن کریم. پێغەمبەر ژی د گەلەك فەرمۆدەیێن خوەدا، گەفان ل وان کەسان دکەت ئەوێن دلێ دەیبابێن خوە دئێشینن، و ئێشاندنا دلێ وان، ب گونەهەکا مەزن ددانت. و ل دۆر پێك و پەیسکا دەیکێ ژی دبێژت:((**الجنة تحت أقدام الامهات**)).

ئانکو: بەهەشت د بن پێ دەیکانداییە. ڕۆژەکێ زەلامەکێ پسیار ژ پێغەمبەری کر، گۆتێ: پێغەمبەرێ خودێ، کی هێژاترین کەسە ئەز قەنجیییێ د گەل بکەم، گۆت: دەیکا تە، گۆتێ

پاشی کی، گۆت: دەیکا تە، جارەکا دی گۆتیێ پاشی کی، گۆت: دەیکا تە، جارا چاریێ ژ نوو گۆت: بابێ تە.

هەر وەسا د فەرمۆدەیەکا دیدا دبێژت: ((رضا الله فی رضا الوالدین)). ئانکو: ڕازیبوونا خودێ د ڕازیبوونا دەیباندایە.

٤- ئاخاڤتنا وان ب نەرمی و دلۆڤانی: ئیسلامێ کا چاوا قەدەغەکرییە کو زاڕۆك ژ دەیبابێن خوە کەربگرتی ببت و دەنگێ خوە ب سەر یێ وان بێخت و دەخسیدارییا خوە ل وان دیار بکەت، وەسا داخواز ژ مە کرییە، زمانێ مە د گەل وان شرین و نەرم بت، خودایێ مەزن د قورئانا پیرۆزدا دبێژت: ((**وَقُل لَّهُمَا قَوْلاً كَرِيماً**)) (الاسراء ٢٣). ئانکو: ب ئاوایەکی وەسا وان باخێڤن کو خاترگرتن تێدابت و خەم و دلئێشی پێ نەگەهتە وان.

٥- بەرێ دەیبابان بدەنە ڕاستی و قەنجییێ: ئەگەر مرۆڤ پێ حەسیا کو ئێك ژ دەیبابان یان هەردو د خەلەتی و گونەهێدا دژین، ئەڤا هنگێ دڤێت ب ئاوایەکی جوان بزاڤێ بکەت کو بەرێ وان ژ وی ڕەفتار و وێ کریارێ وەرگێڕت ئەوا خودایێ مەزن پێ نەخوەش و زیانا دنیایا وان ژی تێدا.

برێنێ چاوا ئیبراهیم پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن)، ڕووباری (پێشبەری) بابێ خوە دبت و هەر وەکی د قورئانا پیرۆزدا هاتی دبێژتێ:((**إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْئاً ﴿٤٢﴾ يَا أَبَتِ إِنِّي قَدْ جَاءنِي مِنَ الْعِلْمِ مَا لَمْ يَأْتِكَ فَاتَّبِعْنِي أَهْدِكَ صِرَاطاً سَوِيّاً ﴿٤٣﴾ يَا أَبَتِ لَا تَعْبُدِ الشَّيْطَانَ إِنَّ الشَّيْطَانَ كَانَ لِلرَّحْمَنِ عَصِيّاً ﴿٤٤﴾**)) (مریم ٤٢ — ٤٤).

ئانکو: دەمێ ئیبراهیم گۆتییە بابێ خوە: بابۆ تو بۆچ وی دپەرێسی ئەوێ نە دبهیست و نە دبینت و نە مفایەکێ دگەهینتە تە و نە خەما تە دخوت و نەشێت چو ژ تە بدەتە پاش، بابۆ ب ڕاستی زانینا بۆ من هاتی بۆ تە نەهاتییە، ژ بەر هندێ داخوازێ ژ تە دکەم، ب دوو من بکەڤی، دا ڕێکا ڕاست نیشا تە بدەم.

ئەڤە ژی هندێ دگەهینت کو هەر کەسەك د ئیسلامێدا، خودانێ کەساتییەکا خوەسەرە و بەرپسیاری د ستوییدایە، دەمێ ئەم د کار و کریارێن باشدا گوهدارییا دەیبابێن خوە دکەین، ئەڤە وێ ڕامانێ نادەت کو ئەم نەشێن ب ئاوایەکی جوان و خشکۆك دان و ستاندنێ د گەل وان بکەین، دا ئەم بەرێ وان ژ بیر و بۆچوون و کریارێن خەلەت وەرگێڕین. ب تایبەتی ژی مرۆڤ پشتی بالق دبت، ل گۆڕ شەریعەتێ ئیسلامی دبتە خودان شیانەکا یاسایی یا تەکووز (کامل) و بەرپسیارە ژ سەرانسەری کریارێن خوە و خودانێ کەساتییەکا خوەسەرە. گوهداریکرنا دەیبابان د تشتێن باشدا و قەنجیکرن د گەل وان، ڕامانا حەلیانا کەساتییا زارۆکی و هەرزەکاری نادەت، بەلکو ئەڤە پشکەکە ژ وی ئەرکێ ئیسلامی و جڤاکی و ئەخلاقی ئەوێ بەرانبەری دەیبابان ل سەر ملێ مە و وەفادارییە بەرانبەری سۆز و ڤیان و وەستیانا وان د وارێ خودانکرنا مەدا، و جهئینانا فەرمانا پەروەردگارییە. قورئان مە فێری هندێ دکەت کو د جهێ خوەدا و بەرانبەری داخوازا نەڕەوایا دەیبابان زارۆك بێژت نە، بەلێ د گەل هندێ ژی، هەر ب قەنجی سەرەدەرییێ د گەل وان بکەت.

٦- خودانکرنا وان: د شەریعەتێ ئیسلامێدا، خودانکرنا زارۆکی هەتا دگەهتە قۆناغا بالقبوونێ، ل سەر دەیبابانە، بەلێ پاشتر ئەگەر دەیبابان، ژ بەر نەخوەشی و بێکارییێ یان ژ بەر پیراتییێ یان ژ بەر هەر ئەگەرەکی دی، شیانا خودانکرنا خوە نەما، ئەها هنگێ خودانکرن و مەسرەفا وان دکەڤتە د ستوییێ زارۆکێن واندا.

٧- مرۆڤ دڤێت د ڤان دەماندا، وان ڕۆژ و سالێن وان سەخمەراتی خودانکرنا مە مەزاختین و تەحلی و نەخوەشی پێڤە دیتین، ژ بیر نەکەت. هەر ژ بەر هندێ دڤێت ئەم ب دەست و دلێن فرەه وان خودان بکەین و نازدارییێن وان د گەورییا خوەدا ببەین و نەهێلین هەست ب کێماسی و بێبارییێ بکەن، دیسا ئەگەر مالا مرۆڤی ژ یا وان جودا ژی بت، هنگێ سەرەدانا بەردەواما وان ژی دبتە ئەرکەکی دی د ستوییێ مەدا بەرانبەری وان.

### دان و ستاندن:

ب چاڤێ تشتێ پێشتر هاتییه بەحسکرن، گرنگترین ئیشك و گرفتارییێن خۆرت و لاوان د ناڤ بنەمالێدا چنە؟

### پسیار:

١- ڕامان ژ ڕەفتارکرنا جوان د گەل دەیبابان چیه و چ بەرپسیارییێ دئێختە د ستوییێ مرۆڤیدا؟

٢- چارەنڤیسێ وان کەسان چیە ئەوێن ڕەفتارێ وان د گەل دەیبابان خراب؟

### ڤەکۆلان:

ئەم چاوا هەڤسەنگییێ بێخینە د ناڤبەرا پارستنا ئازادییا خوەدا ژ ڕەخەکێ و گوهداریکرنا دەیباب و ئەرکێن خوەیێن بنەمالێ ژ ڕەخەکی دی؟

## گرنگترین هۆکارێن دبنە بنسترا پارزتنا دەهمەنپاڤژیا هەرزەکاری

١- هەبوونا هەڤبەندییەکا ڤیانێ یا ب هێز د گەل خودایێ مەزن.

٢- ئاگەهداری ژ وێ بەرپسیارییێ، ئەوا د ستوییێ ویدا.

٣- هلبژارتنا هەڤالێ باش.

٤- هشیاربت کو لەشێ خوە بۆ خرابییێ ب کار نەئینت و بەرێ خوە نەدەتە تشتێ حەرام و ئەندامێن خوە ژ تشتێ نەدورست بپارێزت و ئاگەهـ ژ وان نەخوەشییێن بەلاڤێن جنسی هەبت، ئەوێن ئەڤرۆ ژ نەخوەشییێن ب ترس دئێنە هەژمارتن.

گەلەك ب هشیاری سەرەدەرییێ د گەل ئالاڤێن ڕاگەهاندنێ وەکی کەنالێن ئەسمانی و ئینتەرنێت و فلمێن ڕەنگرەنگ بکەت، چونکی پشکەك ژ ڤان زیانبەخشن، لەو دڤێت ئەم خوە ژێ دوور بێخین، دا ئەم هەڤتووشی زیانا دنیا و ئاخرەتێ نەبین.

**ب - کۆنترۆلکرنا حەزا خوارنێ:**

ئانکو بەرنامەیەکی دورست هەبت بۆ خوارنێ و گرنگییێ بدەتە وان جوونەخوارنێن دخوت، و د هەمان دەمیدا خوە ژ خوارن و ڤەخوارنێن حەرام بپارێزت.

**پ - کۆنترۆلکرنا زمانی:**

پێغەمبەرێ خودێ (سلاڤ لێ بن) د فەرمۆدەیەکێدا دبێژت: ((من كان يؤمن بالله واليوم الآخر فليقل خيرا أو ليصمت)). ئانکو: هەر کەسێ باوەری ب خودێ و ڕۆژا دووماهییێ هەبت، بلا ئاخڤتنا باش و یا خێرێ بکەت یان ژی بلا خوە بێدەنگ بکەت.

**ت – خوەپارزتن ژ چاڤلێکرنا ڕەگەزێ جودا:**

د ئیسلامێدا پێدڤییە هەر ئێك ژ کوڕ و کچان سالۆخەتێن تایبەتێن خوە بپارێزن و د سینۆرێ خوەدا شانازییێ ب ڕەگەزێ خوە بکەن و کەس ژ وان هەست ب کێماسییێ نەکەت بەرانبەری یێ دی.

**ج - تژیکرنا دەمێن بێکارییێ ب کارێن فلیکار و داهێنەر (الابداعیة):**

١- دیتنا وارێن ژێهاتن و ڤیانێ وەك خۆرت و گەنج.

٢- بەرهەڤکرنا هۆکارێن ئینانەجها ژێهاتن و ڤیانێ.

٣- دیتن و فێربوونا رێکێن وەرارکرن و پێشئێخستنا ژێهاتن و ڤیانێ.

٤- بەرهەڤکرنا بەریکانەیان.

**گرنگترین جوونەهیڤیێن کو پێدڤی هەرزەکار د دەمێ بێکارییێدا ئەنجام بدەت:**

١- فێربوونا خواندن و نڤیسینێ.

٢- فێربوونا خواندن و ژ بەرکرنا قورئانێ.

٣- فێربوونا زمانان.

٤- فێربوونا کۆمپیووتەر و ئینتەرنێتێ.

٥- وەرزش.

٦- فێربوونا پەرستن (عیبادەت) و سونەتان.

٧- سەرەدانێن جڤاکی.

زخاندن و هاندانا رەوشتێ باش:

پێدڤییە هەرزەکارێ موسلمان گرنگییێ بدەتە فێربوونا رەوشتێن باش، وەکی دلساخی و سنگفرەهی و لێبۆرین و بەخشندەیی و خێرخوازییێ.

**دان و ستاندن:**

ژ بەر چ دڤێت هەرزەکار دەهمەنپاقژبت، و بزاڤێ بکەت پێپەست و فشارا جنسی ل سەر خوە کێم بکەت، و خوە ب تشتێن مفادارڤە مژوول بکەت؟

## ب دەستڤەئینانا هشیاری و ڕەوشەنبیرییێ:

ئێکەمین پەیڤ ژ قورئانا پیرۆز هاتییە خوارێ، ب (إقرأ) دەست پێ کرییە: ((اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ)) (العلق ١)، ئانکو: (ب ناڤێ وی خودایێ تو چێکری بخوونە). هەروەسا د ئایەتەکا دیدا ب تیپەکا نڤیسینێ سووند دخوت: ((ن وَالْقَلَمِ وَمَا يَسْطُرُونَ)) (القلم ١).

و ئەڤە گرنگییا زانست و فێربوونێ د ئیسلامێدا دیار دکەت، و موسلمانان هاندەدەت کو خودێ ب ڕێکا زانینێ بنیاسن.

ئیسلام فێربوونێ دکەتە ئەرك ل سەر هەمی موسلمانان و ژ ئێکا شەرعیڤە کەسێ پێکۆل و بزاڤێ بۆ نەکەت گونەهکارە، د ڤی واریدا پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة)). ئانکو: فێربوونا زانین و زانستێ، ئەرکە د ستوییێ هەر موسلمانەکێدا ژ مێر بت چ ژی ژن.

ژ بەر هندێ، پێدڤییە خۆرت و گەنجێ موسلمانێ هەرزەکار ل گۆر فەرمانا دینێ خوە، کەسەکی زیرەك و هشیار و خودانشیان بت، و فێربوونا زانین و زانستێ ب فەر بزانت.

ژ بۆ کو تو ببییە هەرزەکارەکی موسلمانی ڕەوشەنبیر، پێدڤییە چەند مەرجەك ل دەڤ تە هەبن:

### ئـ - خوە بنیاسە:

خودایێ مەزن د ئایەتەکێدا دبێژت: ((وَفِي أَنفُسِكُمْ أَفَلَا تُبْصِرُونَ)) (الذاريات ٢١). ئانکو: بەرێ خوە بدەنە خوە ب خوە، ما هوون خوە نابینن.

هەر تشتەکێ مرۆڤ نەزانت، وەك دژمن دئێتە بەر چاڤان، ڤێجا دا تو د گەل خوە ب خوە ئاشنا ببی و تە خوەش بڤێت، پێدڤییە ژ ڕێڤە تو خوە بنیاسی و تە زانیاری ل دۆر خوە هەبن، دا بشێی ب دورستی خوە بپارێزی و هەر ژ بەر هندێ پێدڤییە تە ئەڤ زانیارییە هەبن:

١- سالۆخەتێن هەر قۆناغەکا ژیانا مرۆڤی، چ زارۆکینی بت، چ ژی هەرزەکاری و خۆرتینی و پیری ..

٢- تە زانیاری هەبن ل سەر پێکهاتنا لەشێ خوە و کۆئەندامێن خوە و کا چ پێدڤییە بۆ پارزتنا وان ژ نەخوەشی و ڕاگرتنا لەشی ب ساخلەمییەکا باش.

**ب - دینێ خوە بنیاسە:**

پێدڤییە تە شارەزایی د دینێ خوەدا هەبت، خودایێ مەزن بۆ مە دیار دکەت کو باوەر و ئایین دڤێت ل سەر زانین و زانستێ بێنە ئاڤاکرن، هەر وەکی د قورئانا پیرۆزدا دبێژت: ((**فَاعْلَمْ أَنَّهُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَاسْتَغْفِرْ لِذَنبِكَ ...**)) (محمد ١٩)، ئانکو : بزانە کو چو خودێ ژ بلی (الله) نینن، و داخوازا لێبۆرینی ژ وی بکە بۆ گونەهێن خوە، و هندەك ژ زانایێن ئیسلامی دبێژن: دڤێت زانست بەری کریار و گۆتنێ ژی بت.

ڕۆژەکێ ل دەڤ پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) بەحسێ دو زەلامان هاتە کرن، ئێك ژێ خودێپەرێس بوو، ئەوێ دی زانا بوو، پێغەمبەری (سلاڤ لێ بن) گۆت: ((**فضل العالم علی العابد کفضلی علی أدناکم**)) ئانکو: قەدرێ زانایی بەرانبەری خودێپەرێسی، وەکی قەدرێ منە بەرانبەری یێ ژ هەوە هەمییان بچووکتر، هەر ژ بەر ڤێ چەندێ ژی، فێربوونا زانین و زانستێ ل دەڤ خودێ، ژ کرنا کارێ سونەت مەزنترە.

خودایێ مەزن گەلەك سالۆخەتێن کەسێن زانا و خودان زانیاری ددەت، و ئەوان ب مرۆڤێن خودێترس ددەتە نیاسین، چونکی موعجیزەیا ئیسلامێ زانین و زانستە و ب ڕێکا زانین و زانستێ مرۆڤ دشێت ئەردی ئاڤا بکەت و بنیاتێ شارستانییێ دانت و هەردەم ب ڤێ ڕێکێ ژی هەست ب مەزناتییا خودێ بکەت، و ب ڕێکا دورستکری و چێکرییێن وی شووندەستێ هەمی زانین و زانستێ خودێ ببینت. ژ بەر هندێ، د ئیسلامێدا خواندن و فێربوونا زانستێ ب عیبادەت دئێتە هەژمارتن، و خودانێ وی خەلاتەکی مەزنی خودایی وەردگرت، و ژ ئاگرێ دۆژەهێ دئێتە پارزتن، و دچتە بەهەشتێ.

**پ - وەلاتێ خوە بنیاسە:**

ل ئێرە مەرەم نیاسینا سێ جوونێن وەلاتییە، وەلاتێ ئێکێ کو کوردستانە و نهۆ د ناڤبەرا چار دەولەتاندا هاتییە پشککرن، مللەتێ کورد، مللەتەکە باراپتر ژێ موسلمانن و هەر چار پارچەیێن وی ژی، سەر ب جوگرافیایا وەلاتێن ئیسلامیڤەیە، وەلاتێ دوییێ ژی، ئەو وەلاتن، ئەوێن مللەتێن موسلمان تێدا دژین، چونکی مە د گەل ڤان مللەتان، شارستانی و دیرۆك و دینەکی هەڤپشك هەیە و ژ بەر

ڤێ ئێکێ دڤێت مە هەمییان وەك برا ئێکدو بڤێت و مافێن ئێکدو بپارێزین و زۆرداریێ ل ئێکدو نەکەین و هەڤسۆزێن دۆزێن ڕەواێن ئێکدو بین.

پێغەمبەر (سلاڤ لێ بن) دبێژت: ((**من لم يهتم بأمر المسلمين فليس منهم**)) ئانکو: هەچیێ خەما موسلمانان ڕانەکەت، نە ژ مەیە. ئەڤەژی هندێ دخوازت کو موسلمان هەڤسۆزبن د گەل دۆزا مە.

وەلاتێ سێیێ جیهان هەمییە، چونکی خودێ ئەم وەك مرۆڤ ل سەر ڕوویێ ڤێ جیهانێ چێکرینە، ژ بەر هندێ دڤێت هەڤبەندییەکا دۆستانە و مرۆڤانە د ناڤبەرا مە هەمی مرۆڤاندا هەبت و ئەم سەخمەراتی ئاڤاکرن و دورستکرنا جڤاکەکی مرۆڤاتی، بزاڤ و پێکۆلێ بکەین، کو بنستر و بناخەیا وی ئاشتی و پێکڤەژیان و ڤیان بت.

**ت - ژینگەهـ و دەوروبەرێ خوە بنیاسە:**

پێدڤییە تە ئاگەهـ ژ گوهۆڕینکارییێن سیاسی و ئابۆری و جڤاکی و ڕەوشەنبیرییێن هەرێما کوردستانێ و عیراقێ هەبت، دڤێت وەك وەلاتییەکی دلبێش و دلسۆژ تو خەما پێشڤەبرنا کوردستانێ بخوی و هاریکارییا دەزگەهێن میری بکەی و سەخمەراتی پێشئێخستن و ئاڤاکرن و پارزتنا وی ژ هەمی خرابی و کێماسییان، خەمسارییێ نەکەی.

## چار - شیانا کارکرن و پارەڤەگرتنێ:

پێدڤییە مرۆڤ د سەرێ ژییێ خوەدا بێتە فێرکرن، کو پارە و سامانی ڤەگرت، و دەرێژییێ د مەزاختنێدا نەکەت، چونکی خودایێ مەزن دبێژت: ((وَكُلُواْ وَاشْرَبُواْ وَلاَ تُسْرِفُواْ إِنَّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُسْرِفِينَ)) (الاعراف ٣١). ئانکو: بخون و ڤەخون، بەلێ دەرێژییێ تێدا نەکەن، چونکی خودایێ مەزن، حەز ژ وان کەسان ناکەت ئەوێن دەرێژییێ دکەن، د هەمان دەمیدا دڤێت تو مرۆڤەکی وەسا بی، حەز ژ کار و چەلەنگییێ بکەی، و تە د ژیانا خوەدا بەرنامەیەك هەبت، دا پشتا خوە ب خوە گرێبدەی و ئازادی و ڕێز و کەرامەتا خوە بپارێزی.

**پسیار:**

ئەو چ گرنگییە ئیسلام ددەتە زانین و زانستێ؟

**دان و ستاندن:**

ئەم دێ چاوا ئاستێ ڕەوشەنبیرییا خوە یا ئیسلامی و یا گشتی بلند کەین؟ و ئەڤێ چ کارلێکرن د پاشەڕۆژا ژیانا مەدا و د ڕۆلێ مە د جڤاکێدا هەیە؟

# پێرست

# پێڕست

